


**کەمال سەعدی**

**مامۆستا لە کۆلێژی یاساو رامیاری**

**١٩٩٩ - هەولێر**

پێشکەشە :

# بە هەموو ماف خوراوێک

بیرۆکەی یاسا بیرۆکەیەکی زۆر کۆنە وەك کۆنیی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی، جا بۆ ئەوەی بەرەو قوڵایی ئەم بیرۆکەیە شۆڕبینەوە دەبێ لەواتای یاساوە دەست پێ بکەین چونکە تا لەمانای یاسا نەگەین ناتوانین بنچینەی یاسایی لەبنچینەکانی تری ڕێکخەری ڕەوشتی کۆمەلایەتی جیابکەینەوە هەروەها بایەخی یاساشمان بۆ دەرناکەوێ وەك کۆمەڵە بنچینەیەکی ڕێکخەری ڕەوشتی کۆمەلایەتی.

## واتای یاسا:

واتای یاسا لەرووی زمانەوانییەوە جیاوازە لەگەڵ مانا زاراوەییەیی یەکەی بۆیە بەباشی دەزانین سەرەتا واتای یاسا لەرووی زمانەوانییەوە روون بکەینەوە کەواتای بەردەوامی و جێگیربوون و ڕێك و پێکی دێت.

بۆ نموونە دەڵێن: (یاسای گەردوون) مەبەست لەمە ئەو سیستەمە جێگیرو نەگۆڕی گەردوونەیە کەبەپێی ئەو ئەستێرەکان بەدەورەی خۆیان دەخولێنەوە هەروەها یەك بەدوای یەك هاتنی شەوو ڕۆژیش دەگرێتەوە.

هەروەها دەووترێ یاسای (خستنەروو و داوا خواست) مەبەست لەمە ئەو بنچینە جێگیربوەیە لەزانستی ئابووریدا کە بڕیار لەسەر کاریگەرێتیی خستنەروو و داوا خواستی کەل و پەل و گوزارشت لەسەر بەرزبوەنەوەو نزم بوونەوەی نرخ و کرێکانیان دەدات.

یان (یاسای ماسی) مەبەست لەم بنچینەیەش ئەوەیە ماسی گەورە ماسی بچووك دەخوا هەروەها لەهەندێك وڵاتان پێی دەڵێن (یاسای جەنگلستان) یان حوکمی هێز واتە ئەوەی بەهێزە ویستو ئارەزووی خۆی بەسەر ئەوانی لەخۆی بێ هێزتر دەسەپێنێ.

بەڵام لەرووی زاراوەیی‌یەوە چەمکی یاسا دوو مانای هەیە. یەکیان واتایەکی گشتی‌یە ئەوەی تریشیان تایبەتی‌یە.

یاسا بەمانا گشتی‌یەکەی بریتی‌یە لەو کۆمەڵە بنچینانەی کەژیانی مرۆڤ لەناو کۆمەڵ رێك دەخات، هەموو کەسێکیش رێزیان لێ دەگرێتو دەسەڵاتی گشتی لەرێگای هێزەوە کەفالەتی رێزگرتنیان دەکات.

واتە ئەگەر یەکێك سەرپێچی لێ کردنو رێزی نەگرتن لەلایەن دەسەڵاتی گشتی‌یەوە بەهێز بەرپەرچ دەدرێتەوە واتە سزا دەدرێن.

بەڵام مەبەست لەیاسا بەمانا تایبەتی یەکەی ئەو یاسایەیە کە دەسەڵاتی یاسادانان دایان دەنێت.

ئەوەی شایەنی باسە، یاسا بەمانا گشتی‌یەکەی سنوورەکەی فراوانترە لەیاسا بەمانا تایبەتی‌یەکەی چونکە یاسای دانراو لەلایەن دەسەڵاتی یاسادانانەوە (تشریع) سەرچاوەیەکە لەسەرچاوە زۆرەکانی یاسا.

بۆیە هەموو یاسایەکی دانراو لەلایەن دەسەڵاتی یاسا دانانەوە یاسایە بەڵام هەموو یاسایەك مەرج نیە لەلایەن دەسەڵاتی ناوبراوەوە دانرابێت.

بۆ نموونە بەپێی ماددەی یەك لە یاسا شارستانی عێراقی ژمارە (٤٠)ی ساڵی ١٩٥١ سەرچاوەکانی یاسای عێراقی

– مەبەستمان یاسای بەرکاری عێراقی‌یە– بریتین لە تەشریعو دابو بنچینەکانی شەریعەتی ئیسلامیو بنچینەکانی دادپەروەریو بڕیارەکانی دادگاو بیروڕای یاسازانەکان.

کەواتە تەشریع سەرچاوەیە کە لەپاڵ چەندین سەرچاوەی تردا وەهەر

سەرچاوەیەکیش لەو سەرچاوانە یاسان بەلام تەشریع نین هۆیەکەشی ئەوەیە کە تەنها بەو کۆمەڵە بنچینەیە دەوترێ تە شریع کە لەلایەن دەسەلاتی یاسادانانەوە دادەندرێت.

دوای ئەوەی واتای یاسامان بەهەر دوو مانایەوە (گشتی و تایبەتی) روونکردەوە ئێستا پێویستە ئەگەر بەکورتیش بێت تیشك بخەینەسەر ئەسڵی ئەم زاراوەیەو بزانین لەچی‌یەوەو لەکوێوە هاتۆتە ناو زمانی ئێمە زۆربەی ولاتان ئەسڵی ئەم زاراوەیان بۆ زمانی خۆیان گەڕاندۆتەوە. بۆ نموونە جوولەکەکان دەڵێن ئەسڵەکەی دەگەڕێتەوە بۆ زمانی عیبری هەروەها فارسەکان بۆ زمانی فارسی دەگەڕێننەوە.

بەلام زۆربەی یاسازانەکان لەسەر ئەوە رێك کەوتوون کە ئەم زاراوەیە ئەسڵەکەی وشەیەکی لاتینی‌یەو لەووشەی Kanon وەرگیراوە کە بەمانای بنچینەیان رێکخستن دێت.

شایانی باسە، فەرەنسی‌یەکان وشەی (Anon)یان لێ داتاشیوەو مەبەستیان لەم وشەیە ئەو بڕیارانە بوو کە کەنیسە دەری دەکردن هەروەها ئینگلیزەکان وشەی (Canon Law) یان لێی داتیشەوەو مەبەستیان لێی ئەو بڕیارانە بوو کە کەنیسە دەری دەکردن.

بەلام لەنێشتمانی عەرەبیدا سەرەڕای هەندێ بیروڕای یاسا زانان کە ژمارەیەکی کەم پێك دینن و دەڵێن ئەسڵی ئەم وشەیە عەرەبی‌یە زۆربەیان لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەم زاراوەیە زاراوەیەکی بێگانەیەو لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە لەلایەن ئیمپراتۆریەتی عوسمانی‌یەوە هاتۆتە ناو ولاتە عەرەبی یەکان.

عوسمانی‌یەکان زاراوەی یاسایان بۆ هەر کۆمەڵە بنچینەیەکی یاسایی بەکار دەهێنا کە لەبوارێك لەبوارە جیاجیاکانەوە پەیوەندیە یاسایی‌یەکانی ناو کۆمەڵی رێك دەخست.

لەبەر ئەوەی لەفزی یاسا لەزمانی ئێمەدا دوو مانای هەیە بۆیە پێویستە لەیەکیان جیابکەینەوە تاوەکو تێکەڵ‌ی یەك نەبن.

لەراستیدا ئەم تێکەڵی‌یە لەزمانەکانی بێگانەدا ڕوو نادات چونکە بۆ هەر یەکێ: لە یاسا بەماناگشتی‌یەکەی‌و یاسا بەمانا تایبەتی‌یەکەی زاراوەیەکی تایبەتی‌یان داناوە، بۆ نموونە لەفەڕەنسا زاراوەی (Droit) یان بەمەبەستی یاسا بەمانا گشتی‌یەکەی بەکارهێناوەو (Loi)یان بەمەبەستی یاسا بەمانا تایبەتی‌یەکەی بەکارهێناوە.

هەروەها لە ئینگلتەرا زاراوەی (Law)یان بەمانای یەکەم‌و (Legislation) یان بەمانای دووەم بەکارهێناوە بەڵام لەزمانی عەرەبیدا زاراوەی (قانون) یان بەهەردوو مانا بەکارهێناوە هەروەها لەزمانی کوردیشدا زاراوەی یاسایان بۆ هەردوو مەبەست بەکارهێناوە.

شایەنی باسە، بەپێچەوانەی حاڵەتی سەرەوە ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین لە زۆربەی زمانە بیانیەکاندا بە پێچەوانەی زمانی کوردی‌و عەرەبی جۆرە تێکەڵاویەکەیان لەنێوان واتای (یاسا)و (ماف) کردووە.

بۆ نموونە لەزمانی فەرەنسیدا (Droit) بۆ هەردوو چەمکی (یاسا)و (ماف) بەکاردەهێت.

بەڵام لەزمانی ئینگلیزیدا زاراوەی جیاوازیان بۆ هەرەیەکێك لەو دوو چەمکە بەکارهێناوە بۆ نموونە زاراوەی (Law)یان بۆ یاسا بەکارهێناوەو زاراوەی (Right) یان بۆ ماف بەکارهێناوە.

هەروەها لەزمانی عەرەبیشدا زاراوەی (القانون) یان بۆ یاسا بەکارهێناوەو زاراوەی (الحق)یشیان بۆ ماف ئەکارهێناوە.

ئەگەر سەرنجی زمانی کوردیش بدەین هەروەکو لەسەرەوە ئاماژەمان بۆی کرد دەبینین هەردوو زاراوەی (یاسا)و (ماف)مان وەك دوو زاراوەی سەربەخۆ بۆ هەردوو مەبەست بەکارهێناوە.

لەراستیدا، یاسا زانە فەرنسی‌یەکان ویستیان چارەسەری ئەم تێکەڵی‌یە بکەن ئەویش بە بەکارهێنانی وشەیەکی پاشکۆ بۆ زاراوەی (Droit) بۆ ئەوەی ئەو واتایەی

مەبەستە دیاریی بکەن، بۆ یە زاراوەی (Droitobjectif) یان بۆ مانای یاسا بەکارهێناو زاراوەی (Droitsubjectif) یشیان بۆ ماف بەکارهێنا.

دوای ئەوەی واتای یاسامان روو روونکردەوە ئێستا نۆرەی ئەوە هاتووە کە بنچینەی یاسایی لە بنچینەکانی تری کۆمەڵایەتی جیابکەینەوە.

هەروەکو لەپێشەوە وتمان زۆر کۆمەڵە بنچینەی کۆمەڵایەتی‌مان هەن کە رەوشتی مرۆڤ لەناو کۆمەڵ رێك دەخەن. ئەو کۆمەڵە بنچینانە ئایین یان بنچینەی موجامەلەن وەیان بنچینەی رەوشت یان بنچینەی دادپەروەرین.. هتد بۆیە لەخوارەوە لەچەند خاڵێکدا یەکە یەکە ئەو بنچینانە لەگەڵ بنچینەی یاسایی بەراورد دەکەین.

## یەکەم بنچینەی یاسایی و بنچینەی ئایین.

بنچینەکانی ئایین بریتین لەو ئەحکامانەی کە خوای گەورە داینـاون جا چی لەرێگای قورئانی پیرۆزەوە داینابێ وەیان لەرێگای سونەتی پێغەمبەرخوا محەمەد کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدول موتەلەیب (د.خ) لەقسەو کردەوەو پەسند کردن.

### بنچینەکانی ئایین دەکرێنە سێ بەش:

ا- بنچینەکانی خواپەرستی کە پەیوەندی نێوان مرۆڤ بە خواوە رێك دەخەن.

ب- بنچینەکانی رەوشت کەپەیوە ندی مرۆڤ بەخودی خۆیەوە رێك دەخەن.

ج- بنچینەکانی مامەڵە کەپەیوەندی نێوان مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤی تردا رێك دەخات.

ئەوەی ئێمە مەبەستمانە، بنچینە کانی مامەڵەیە کە لەچەند لایەنێکەوە جیاوازن لە بنچینەکانی یاسایی هەروەکو لە خوارەوە دەیبینین:_

ا- لەرووی سەرچاوەوە:

سەرچاوەی بنچینەکانی ئایین ئاسمانە هەروەکو لەسەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد دانراوی خوای گەورەیە، بەڵام بنچینەکانی یاسایی سەرچاوەکەیان دانراوی سەر

دونیایە واتە یاسادانەر دایان دەنێت وەیان بڕیاریان لەسەر دەدات و هێزیان پێ دەبەخشێ.

٢- لەرووی سزاوە واتە: ڕۆژی زیندوبوونەوە بۆ نمونە خوای گەورە بنچینەکانی ئایین لکاون بە سزایەکی دوو فاقیانە (مزدوج) کە بریتی‌یە لەسزایەکی سەردونیاو یەکێکی تری دوا ڕۆژ لەسورەتی النور لەئایەتی (٤) دەفەرموێ: (وە کەسانێ کە تۆمەتی زینا دەخەنە پاڵ ژنانی داوێن، پاك و لەپاشان چوار شایەد بۆ قسەی خۆیان ناهێنن هەشتا داریان لێ بدەن و ئیتر قەت شایەدیان لێ قەبووڵ مەکەن و ئەوانە فاسقن).

هەروەها دەشزانین بەپێی ئەحکامەکانی قورئانی پیرۆز فاسقان لەڕۆژی زیندووبوونەوە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخ و دەسوتێندرێن.

بەڵام بنچینەکانی یاسا لکاون بە تاکە سزایەك کەئەویش سزای سەردونیایەو بەس، ئەو سزایەیە کەلەلایەن دەسەڵاتی گشتی تایبەتمەندەوە بەسەر سەرپێچی کەردا دەسەپێندرێ.

هەروەکو لەم بنچینە یاساییەی خوارەوە بۆمان دەرکەوێ.

ماددەی (٤٠٥) لەیاسای سزادانی عیراقی ژمارە (١١١) ١٩٦٨ هەموار کراو: (ئەوەی یەکێ: بە ئەنقەست بکوژێت سزا دەدری بە بەندی نشینی هەمیشەیی یان کاتی).

## دووەم: بنچینەکانی یاسا یی و بنچینەکانی موجامەلات:

بنچینەکانی موجاملات بریتین لەبنچینەکانی ڕەوشتی کۆمەڵایەتی کە لەسەر بیرۆکەی موجامەلە دروست بوونە، وەك سڵاوکردن لەکاتی بەیەك گەیشتندا هەروەها نەشکاندنی بەڵێن و بەشداری کردن لەخۆشی و ناخۆشی یەکتر.

بۆ نموونە ئەگەر یەکێك دراوسێکەی ناخۆشی‌یەکی بەسەر داهات یان دووچاری کارەساتێك بوو بەپێی بنچینەکانی موجامەلات دەبێ دراوسێکانی دڵی بدەنەوەو سەرەخۆشی لێ بکەن وە ئەگەر لەو ڕۆژەدا زەماوەند یان بۆنەیەکی لەو بابەتەیان

لەپێش بوو پێویستە دوای بخەن ئەگەر ئەمەیان نەکرد ئەوا بەسەرپێچی کردنی ئەو بنچینەیە دەژمێردرێ.

لەراستیدا ئەم بنچینانە بەپێی شوێن و کات دەگۆڕێن هەروەها لەڕووی سزاشەوە نەلکاون بەسزایەکی ماددی بەڵکو لکاون بەسزایەکی واتایی (معنوی) کە خۆی لەنارەزایی کۆمەڵ بەرجەستە دەکات جا چ تاکێکی کۆمەڵ نارەزایی دژی سەرپێچی کەرەکە پیشان بدات وەیان کۆمەڵ.

واتە نارەزایی دژ بەرەوشتی سەرپێچی کەرەکە پیشان دەدرێ.

ئەوەی شایەنی باسە، هەندی جار هەندێك لەو بنچینانە لەبنچینەی موجامەلاتەوە دەگۆڕێن بۆ بنچینەی یاسایی جا ئەوکاتە لەجیاتی سزایەکی واتایی بەسزایەکی ماددی دەلکێ و لەجیاتی کۆمەڵ بەگشتی یان تاکەکانی سزایەکە بەسەر سەرپێچی کەر بسەپێنێ، دەسەڵاتی گشتیی تایبەتمەند دەیسەپێنێ.

بۆ نموونەن بەپێی بنچینەیەکی موجامەلات ئەگەر ئافرەتێك سواری پاسی هاتووچۆی گشتی بوو، ئەگەر کورسی بەتاڵ لەناو پاسەکە نەمابوو بۆ دانیشتنی ئەو ئافرەتە، دەبێ پیاوێك بۆی هەڵسێتەوەو کورسی‌یەکەی خۆی پێ ببەخشێ. ئەگەر ئەمەی نەکرد لۆمە دەکرێت و لەلایەن ئەفەرەکانی ناو پاسەکەوە نارەزایی لەدژی رەوشتەکەی دەکرێت. بەڵام دەبینین لەهەندێ وڵاتان وەك ئێران ئەم بنچینەیە بۆتە بنچینەیەکی یاسایی و بەسزایەکی ماددی واتە یاسایی لکاوەو سەرپێچی کەریش لەلایەن دەسەڵاتی گشتی تایبەتمەندەوە سزا دەدرێ.

هەر بۆ ئەم مەبەستە لەئێران بەشێکی کورسییەکانی ناو پاسەکانیان تەرخان کردووە بۆ دانیشتنی ئافرەتان بۆیە ئەگەر پیاوێك لەسەر ئەو کورسیانە دانیشێ و بۆ ئافرەتان هەڵنەستا بەپێی بنچینەی یاسایی بەسزایەکی ماددی (یاسایی) سزا دەدرێ.

## سێیەم: بنچینەی یاسایی و بنچینەی رەوشت:

بنچینەی رەوشت ئەو بنچینانەن شتە چاکەکان و شتە خراپەکانمان لەناو

کۆمەڵدا بۆ دیاردەکەن لەکات و شوێنێکی دیاری کراودا هەروەها ئەو بنچینانە بەسزایەکی واتایی‌یەوە لکاون کەبریتی‌یە لەلۆمەو ناڕەزایی کۆمەڵ.

زۆربەی بنچینەکانی ڕەوشت سەرچاوەکەیان ئایینە هەروەکو چۆن خوای گەورە لەئایەتی ( ٩٠ ) لەسورەتی ( النحل ) لەقورئانی پیرۆز دەفەرمووێ:(ان الله يأمركم بالعدل).

بۆ نموونە بەپێی بنچینەکانی ڕەوشت کوشتنی بەناهەق و ئازاردانی خەڵک و دزی و جوێن و تیرو توانج لەیەکتر گرتن قەدەغەیە. هەر بۆیە دەبینین زۆرجاران ئەو شتانەی بنچینەکانی ڕەوشت نەفرەتی لێ دەکەن و قەدەغەی دەکەن بنچینەکانی یاساش قەدەغەی دەکەن.

بەواتایەکی تر زۆربەی دەقە یاسایی‌یەکان لەوە زیاتر نین کە کۆمەڵێک بنچینەی ڕەوشتن.

هەروەها هەندێک بنچینەی یاسایی هەن دژی بنچینەکانی ڕەوشتن و لەگەڵی کۆک نین هەروەکو بنچینەکانی بەسەرچوونی دۆڕێنەر (التقادم المسقط)یان بەسەرچوونی وەدەست هێنەر (التقادم المكسب).

بەپێی بنچینەکانی بەسەرچوونی دۆڕێنەر خاوەن ماف لەداواکردنی مافەکەی بێ بەش دەبێ بەپێی یاسا بەپێچەوانەی بنچینەکانی ڕەوشت.

هەروەها بنچینەکانی ڕەوشت جیاوازن لەبنچینەکانی یاسا لەڕوانگەی سزاوە واتە بنچینەی ڕەوشت بەستراوەتەوە بەسزایەکی واتایی‌یەوە کەبریتی‌یە لە(تأنیب الضمیر) ئازاردانی ویژدانی ئەو کەسەی کە سەرپێچی دەکات هەروەها لۆمەو ناڕەزایی کۆمەڵ بەرامبەری.

هەروەها لەڕووی ئەو دەسەڵاتەشەوە لێک جیاوازن کەتایبەتمەندە بەسەپاندنی ئەو سزایە.

هەروەکو بینیمان ئەو لایەنە ویژدانی خودی سەرپێچی کەرەکە خۆی بوو دوایی ئەو کۆمەڵەی کەتیایدا دەژێت نەک دەسەڵاتی گشتی.

بۆ نموونە بەپێی بنچینەیەکی رەوشت نابێ مرۆڤ هیچ کەسێك بەبێ خەتا بکوژێ.

هەروەها بەپێی بنچینەیەکی یاساش لەیاسای سزادانی عێراقی تر ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ هەموار کراو لەمادده (٤٨٥)دا هاتووە (هەر یەکێك ببێتە هۆی مراندن یان زامدار کردنی ئاژەڵ یان وڵاغی یەکێکی سزادەدرێ بە بەندینشین بۆ ماوەیەك کە لەدەرۆژ زیاتر نەبێت یان بەغرامەیەك کەلەدەدینا زیاتر نەبێت) ئەگەر سەرنجی ئەم دوو بنچینەیە بدەین دەبینین لەبنچینەی یەکەمدا کەبنچینەیەکی رەوشتە بەستراوەتەوە بەسزایەکی واتایی و سەرپێچی کەر لەلایەن خودی خۆیەوە سزا دەدرێ بەئازاردانی ویژدانی خۆی هەروەها ئەگەر کۆمەڵیش پێی بزانێت ئەوا لەلایەن ئەوانیشەوە لەرێگای لۆمەو نارەزاییەوە سزا دەدرێ.

بەڵام لەحاڵەتی دووەمدا بنچینە یاساییەکە بەسزایەکی ماددی بەستراوەتەوەو سەرپێچی کەرەکەش کەبکوژەکەیە لەلایەن دەسەڵاتی گشتییەوە سزا دەدرێ.

دوای ئەوەی بنچینەی یاساییمان لەگەڵ چەند بنچینەیەکی تری کۆمەڵایەتی بەراورد کرد با بزانین ئایا یاسا پێویستە بۆ کۆمەڵ یان نا؟ بەواتایەکی تر ئایا دەکرێ کۆمەڵ دەست بەرداری یاسا بێت یان نا؟

لەخوارەوە بەتیشك خستنە سەر ئەم لایەنە لەروانگەی چەندین یاسازانەوە وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەینەوە.

## پێویستی یاسا:

### ئایا یاسا پێویستە بۆ کۆمەڵ یان نا؟

ئەمە پرسیارێکەو هەریەکێك لەیاسازانەکان لەروانگەی خۆیەوە تێی دەروانێت بۆیە دوو بیروڕای جیاواز لەم بارەیەوە دروست بووە، هەندێکیان دەڵێن یاسا پێویست نییە بۆ کۆمەڵ بەڵام ئەوانی تر بەپێویستی دەزانن و دەڵێن کۆمەڵ لەهەر کوێیەك هەبێت بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی یاسا دەبێت.

کۆمەڵەی یەکەم لەیاسا زانەکان کە لەسەرووی هەموویانەوە ئەفلاتون و مارکس دێن وای بۆ دەچن کەیاسا زەرووری نیە بۆ مرۆڤ لەنێو کۆمەڵدا. بۆیە ئەو یاسازان و فەیلەسوفانە بەهەموو شێوەیەك ڕەفزی یاسایان کرد. بۆ نموونە ئەفلاتوون لەکۆمارەکەی خۆیدا ئەقڵی بەرەگەزێك لەرەگەزەکانی دەوڵەت داناوی چا بۆیە دەڵێ ئەو کەسانەی دەسەلاتی وڵات دەگرنە دەست تەمسیلی ئەقڵ دەکەن واتە ئاقڵن بۆیە نابێ دەستیان بەیاسا ببەسترێتەوە چونکە ئەو کەسانە ئاقڵن و لەبەڕێوەبردنی کارەکانیاندا هەڵە ناکەن بۆیە ڕەوا نی یە کۆت و تەگەرەیان لەبەردەم دروست بکرێ.

هەروەها پیاوانی ئاینی لەرۆژهەلات و رۆژئاوادا تا ماوەیەکی زۆر دژایەتی یاسایان کرد بەتایبەتی بێ لەمارکسیەت تاکو ئێستاش کەسانێکی زۆر هەن لایەنگرێتی ی فەوزا دەکەن بۆ چارەسەر کردنی گیروگرفتە کەسایەتی و کۆمەڵایەتی یەکانی مرۆڤ.

شایەنی باسە، لەهەموو سەردەمێکدا بەسەردەمی ئێستاشەوە کەسانێك هەن هەموو دەم بێزاری لەدژی دەسەلات دەردەبڕن. ئەو کەسانە لەرێگای خۆپیشاندان و مانگرتن تەعبیر لەو ناڕەزایی یەی خۆیان بەرامبەر یاساو ئیزام دەکەن.

لەراستیدا، ئەو کەسانە بەوپەڕی دڵسۆزی یەوە لەدەوری بیرۆکەیەکی لێڵ کۆبوونەتەوەو وای بۆ دەچن کەبەخۆپیشاندان و بازو هەڵکردن بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەگەنە مەرامەکانیان ژیانێکی ئاسوودەترو باشتر بەرەگەزی مرۆڤایەتی دەبەخشن.

ئا لێرەدا بیرۆکەی رێکخستنی فەوزا دروست بوو کەبەپێی ئەو بیرۆکەیە لەجیاتی سەرکوت کردنی فەوزەوی یەکان و دامرکاندنەوەی فەوزا دەبێ فەوزاکە بەپێی یاسا رێك بخسترێ.

لەراستیدا دیاردەی خۆپیشاندانی کرێکاران و چین و توێژەکانی تری کۆمەڵ و مانگرتنیان لەوڵاتە رۆژئاوایی یەکاندا درێژەپێدانی ئەم بۆچوونەن بەپێچەوانەی وڵاتانی رۆژهەلات کەرێگای پێ نادرێت و سەرکوتیش دەکرێ.

داخستنی رێگا لەبەردەم ئۆتۆمبێلەکان و پەرت و بڵاوبوونەوەی پیادە بەناو ئەو

ڕێگایانەدا فەوزایە بەڵام کاتێك بەرێنمایی‌یەکی بەڕێوەبەرێتی‌ی هاتووچۆ ئەو ڕێگایە دادەخرێ‌و ڕێگا بەپیادەدەدرێ پیایدا بێن‌و بچن ڕێکخستنی ئەو فەوزایەیە.

ئەگەر ئەمە بیروڕای هەندێك یاسازان‌و فەیلەسووفان بێت دەبینین هەندێکی تریش هەن بەپێچەوانەی ئەوان یاسا بەپێویست دەزانن بۆیە وای بۆ دەچن کە لەهەر کوێ‌یەك کۆمەڵ هەبێت دەبێ یاساش هەبێت. لەسەرووی هەموویانەوە ئەرستۆی فەیلەسووف دێت، وای بۆ دەچێ کەمرۆڤ بەسروشتەکەی کۆمەڵایەتی‌یەوە ناتوانێ دوور لەکۆمەڵ بژێێت. هەر لەم بارەیەوە دەڵێ ئەو مرۆڤەی دوور لەکۆمەڵ بوونی بۆ هەبێ لەئاژەڵێك بەولاوە هیچی تر نیە. بۆیە ئەو چیرۆکەی سەبارەت بەرۆبیسن کرۆسۆ کراوە بەچیرۆکێکی خەیاڵی‌و میتافیزیقی دادەنێت.

شایەنی باسە، ئەفلاتوونیش لەقۆناغێکی تردا لەڕای خۆی پەشیمان بۆتەوەو یاسای بۆ کۆمەڵ بەشتێکی پێویست داناوەو زۆر بەڕاشکاوی‌یەوە لەکتابەکەی (دووەمیدا) کە دوای کۆمارەکەی بەچاپی گەیاندووە ئاماژەی بەمە کردووە.

ئەم کۆمەڵەیە وای بۆ دەچن کەمرۆڤ بەسروشت بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی‌یە.

واتە بەبێ کۆمەڵ هەڵناکات‌و ناتوانێ دوور لەکۆمەڵ بژێێت.

جا کەواتە مرۆڤ کەدێتە ناو کۆمەڵەوە بەحوکمی ئەوە بۆ دابین کردنی پێداویستی‌یەکانی کۆمەڵێك پەیوەندی لەنێوانیاندا دروست دەبێت.

وە لەبەرئەوەی مرۆڤ هەر بەسروشت خۆویستە واتە خۆی خۆش دەوێ بۆیە هەردەم هەوڵی ئەوە دەدات بەرژەوەندی خۆی بخاتە پێش بەرژەوەندی گشتی‌یەوە واتە پێش بەرژەوەندی کۆمەڵەوە.

کەوابوو گشت تاکەکانی کۆمەڵ بەرژەوەندی‌یە تایبەتی‌یەکانی خۆیان دەخەنە پێش بەرژەوەندی ئەوانی تر کەئەمەش خۆی لەخۆی‌دا دەبێتە هۆی بەگژیەکچوونی بەرژەوەندییەکان واتە لەئەنجامی دروست بوونی ئەو بەرژەوەندی‌یانەو خۆ خۆشویستنی مرۆڤ‌و تەفزیلکردنی بەرژەوەندی‌یە تایبەتی‌یەکانیان لەسەر حسێبی بەرژەوەندی ئەوانی تر دەبێتە هۆی بەرپا بوونی شەڕو پێك دادان.

هەر بەم بۆنەیەوە زانای ئینگلیز هۆبز Hobbes دەڵێ سروشتی مرۆڤ شەڕانگێزە واتە مرۆڤ بەسروشت شەڕانگێزەو مرۆڤی کۆن بەهۆی ئەم سروشتەیەوە لەزنجیرە شەڕێکی درێژخایەندا بووە بەڵام دوای پەیدابوونی یاساو رێکخستنی کۆمەڵ ئەم قەوزایە نەماوەو بۆتە کۆمەڵگایەکی شارستانی.

بۆیە هۆبز وای بۆ دەچێ ئەگەر یاسا لەکۆمەڵ بکێشینەوە دەبێتە قەوزاو هەر یەکێك لەتاکەکانی کۆمەڵ لەناو خەندەقی جەنگ دادەبێ بەرامبەر تاکەکانی تری کۆمەڵ. واتە جەنگی هەمووان دژی هەمووان وە لەم حاڵەتەدا هیچ یەکێك خاوەن ماف نابێت.

هەر بەم واتایە (برۆدۆن)ی فەیلەسووف دەڵێ:(تەواوی کۆمەڵ بەباشترین شێوەی لەو کاتەدا دەبێ کەقەوزاو نیزام یەك دەگرن).

هەروەها هیوم Hume لەم بارەیەوە دەڵێ: (کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەبێ یاساو حکومەت و سەرکوت کردن هیچ بوونێکی بۆ نەبووە، وە لێرەدا یاسا زەروورەتێکی سروشتییە بۆ مرۆڤ).

هەر بەم بۆنەیەوە میکافیلی ئامۆژگاری ئەمیرەکان دەکات بۆ پەیمان شکاندن و دەڵێ:(ئەگەر هات و ئەو پەیمانە لەگەڵ بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان تەعاروزی کرد، لەبەرئەوەی مرۆڤ بەسروشت خراپن و بێ وەفان بۆیە پێویستە ئەمیرەکان هیچ رێزێکی وەفاداریان بۆ نەنوێنن).

لەکۆتاییدا دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کەیاسا زۆر پێویستە بۆ رێکخستن و بەردەوامی کۆمەڵ بۆیە ئێمە چەند رێز لەیاسا بگرین هێندە لەشارستانیەت نزیك دەبینەوەو چەندیش لێی دوور بکەوینەوە هێندە کۆمەڵەکەمان ناتەواو دەبێت و بەرەو پاشاگەردانی هەنگاو دەنێین.

بۆیە ئەرستۆ وتوویەتی:(بوونی یاسایەکی زاڵم "ستەمکار" باشترە لەنەبوونی یاسایەك) چونکە ئەگەر بەیاسایەکی زاڵم هەندێ لەمافەکانمان لەدەست بدەین بەنەبوونی یاسا خاوەنی هیچ مافێك نابین.

هەر لەم بارەیەوە کاك مەسعود بارزانی سەبارەت بەسەقامگیر بوونی یاسا دەڵێ:(لەکوردستان نابێ هیچ کەسێك لەیاسا بەرزتر بێ) هەر بەم واتایەش سەرۆکی ئێستای لوبنان لەحود لەکاتی سوێندخواردنی دەستوریدا لەبەردەم پەرلەمانی لوبنانیدا وتی:(من دەچمە ژێرەوەی یاسا تاوەکو لەلوبنان کەسێك نەبێت بچێتە سەرەوەی یاسا).

## پێناسەی بنچینەی یاسایی:

بنچینەی یاسایی بنچینەیەکی رەوشتی‌ی کۆمەڵایەتی گشتی و موجەرەدە. پەیوەندییەکانی نێوان کەسان لەنێو کۆمەڵ رێك دەخات، سزایەکی ماددی لەگەڵدایە دەسەڵاتی تایبەتمەند دەیسەپێنێ.

# سیفاتەکانی بنچینەی یاسایی:

## ١- بنچینەی یاسایی بنچینەیەکی رێکخەری رەوشتی کۆمەڵایەتی‌یە.

مەبەستمان لەم خاسیەتە ئەوەیە، کەبنچینەی یاسایی ئەرکە سەرەکی‌یەکەی ئەوەیە کەبایەخ بەرەوشتی مرۆڤ دەدات لەنێوکۆمەڵداو رێکی دەخات. واتە ئەو رەوشتە بۆ مرۆڤ دیاردەکات کەدەبێ وابێ نەك وەکو وایە.٢- بنچینەی یاسایی پەیوەندی لەنێوان کەسان رێك دەخات:

هەروەها بنچینەی یاسایی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و مرۆڤ رێك دەخات نەك مرۆڤ و ئاژەڵ وەیان مرۆڤ و بێ گیانێك.

ئەو بنچینەیەی دەڵێ:(هەر دەست درێژی‌یەك زیانێکی تر بێ لەو زیانانەی لەماددەکانی پێشوو ناویان هاتووە بگەیەنێت بەغەیر دەبێ قەرەبووی بکرێت)[1] بنچینەیەکی یاسایی‌یە چونکە پەیوەندی لەنێوان کەساندا رێك دەخات بەڵام سەرەڕای

---

١ - ماددەی (٢٠٤) لەیاسای شارستانی عێراق ژمارە ٤٠ سالی ١٩٥٦

ئەوەش هەندێك بنچینەی یاساییمان هەن ئەگەر تەماشای بکەین بۆ یەکەم جار وا دێتە بەرچاومان کەپەیوەندی نێوان کەسێكو ئاژەڵێك رێك بخات کەچی لەراستیدا پەیوەندی لەنێوان کەساندا رێك دەخات.

هەروەکو ئەو بنچینەیەی کەراوی ماسی لەوەرزی زاوزێ قەدەغە دەکات وەیان ئەو بنچینەیەی کەراوی جۆرە ئاژەڵێك لەکوردستان قەدەغە دەکات.

ئەگەر سەرنجی ئەم دوو بنچینەیەی سەرەوە بدەین لەسەرەتا وا هەست دەکەین کەلایەنێکی ئەو پەیوەندییە مرۆڤ بێت کەخۆی لەراوکەردا دەبینێتەوەو لایەنەکەی تریش ئاژەڵ بێت. بەلام لەراستیدا وانییە بەڵکو هەردوو لایەنی پەیوەندییەکە مرۆڤە. چونکە کەسانێك هەن ژیانیان لەسەر بەرهەمی ماسییە بۆیە کاتێك یاسا راوەماسی لەوەرزی زاوزێدا قەدەغە دەکات مەبەستی لەوەدا پاراستنی سامانی ماسیو پاراستنی مافی کەسانی ترە بەتایبەتی ئەو کەسانەی کەژیانیان لەسەر ئەو جۆرە زیندەوەرەیە. هەروەها لەحاڵەتی دووەمدا راوکردنی ئە وجۆرە ئاژەڵە لەلایەن راوکەرانەوە دەبێتە مایەی خەمو پەژارەو ئازارێکی دەروونی بۆ کەسانێکی تر کەئەم جۆرە ئاژەڵەیان لەلا زۆر خۆشەویستەو بەقڕبوونی خەم دەخۆن. کەواتە کاتێك یاسا ئەم راوە قەدەغە دەکات مەبەستی رێکخستنی پەیوەندی نێوان مرۆڤو مرۆڤە نەك مرۆڤو ئاژەڵ.

شایەنی باسە، هەروەکو لەسەرەوەش باسمان کرد بنچینەی یاسایی هەرگیز پەیوەندییەکانی نێوان کەسان لەنێو کۆمەڵدا رێك دەخات نەك لەدەرەوەی کۆمەڵ.

یاسا ئیشی بەکەسێك نیە کەدوور بێت لەکۆمەڵ چونکە ئەو کەسەی لەدەرەوەی کۆمەڵ بێت دڕندەیە نەك مرۆڤ هەروەکو ئەرستۆ دەڵێ.

## ٢- بنچینەی یاسایی بنچینەیەکی گشتیو موجەڕەدە:

ئەم سیفەتە کاتێك لەبنچینەی یاسایی دێتەدی ئەگەر هاتوو بنچینەکە وتارەکەی ئاراستەی کەسان بکات بەبێ ئەوەی مەبەستی خودی کەسێکی دیاری کراو بێت

هەروەها چارەسەری رووداوەکان بکات بەبێ ئەوەی مەبەستی رووداوێکی دیاری کراو بێت.

ئەم فەرمانە زۆر پێویستە بۆ بەدیهێنانی رێکخستن و سەقامگیربوون و یەکسانی لەناو کۆمەڵداو یەکسانیش لەبەردەم یاسا لەنێوان خەڵکاندا دێنێتەدی.

بنچینەی یاسایی ئەو کاتە بنچینەیەکی گشتی دەبێت کەلەسەر گشت تاکەکانی کۆمەڵ بچەسپێت وەکو ئەو بنچینەیەی کە بە بەندینشین سزای دز دەدات.

گشتێتی بنچینەی یاسایی مانای ئەوە نی یە کەدەبێ حوکمەکەی گشت خەڵکی بگرێتەوە، چونکە عبرەت بەژمارەی ئەو کەسانە نی یە کەبنچینەکەیان ئاراستە دەکرێت بەڵکو بەسیفەتی ئەو کەسانەیە کەدەیانگرێتەوە.

وا دەبێت بنچینەیەك گشتی بێت هەرچەندە چەسپاندنەکەی تەنیا هەندێك کەس بگرێتەوە یان هەندێك کردار بگرێتەوە کەئەو کردارانە بەکۆمەڵێك سیفات یان مەرج دیاری کرابن، بۆ نموونە وەکو یاسای پارێزەران یان یاسای سەندیکای پزیشکان یان سەندیکای رۆژنامەنووسان ئەگەر سەرنجی ئەو کۆمەڵە بنچینە یاساییانە بدەین دەبینین ئاراستەی هەندێك کەسانی ناو کۆمەڵ کراون نەك گشت تاکەکانی کۆمەڵ کەئەوانیش توێژی پارێزەران و پزیشکان و رۆژنامەنووسانن، بەڵام کەئاراستەیان کراوە لەبەر خودی ئەو کەسانە نەبووە بەڵکو لەبەر ئەو سیفاتانەیانە کەهەیانە نەك لەبەر خودی خۆیان.

هەروەها ئەو یاسایەی کاری بازرگانی رێك دەخات بنچینەیەکی گشتی یە سەرەڕای ئەوەی تەنیا لەسەر جۆرە کارێك دەچەسپێ نەك گشت کارێك چونکە ئەو کارانە بەکۆمەڵە سیفاتێك وەیان کۆمەڵە مەرجێك لەکارەکانی تر جیاکراونەتەوە.

هەروەها هەندێك جار وا رێك دەکەوێ بنچینەی یاسایی تەنیا لەسەر تاکە کەسێك دەچەسپێت سەرەڕای ئەمەش بە بنچینەیەکی گشتی دەژمێردرێت ئەگەر هاتوو ئەو کەسە لەبەر سیفەتەکانی مەبەست بوو نەك لەبەر خودی خۆی هەروەکو ئەو بنچینە یاسایی یەی ماف و ئەرکەکان و دەسەڵاتەکانی سەرۆکی وڵات دیار دەکات.

ئەوەی شایەنی باسە، ئەم بنچینەیە ریزپەڕ (استثناء)ێکی هەیە ئەویش ئەوەیە هەندێك جار یاسایەك لەبەر خودی تاکە کەسێکدەردەچێت وەك ئەو یاسایەی مووچەیەکی هەمیشەیی بۆ تاکە کەسێکی دیاری کراو بەخود دەبڕێتەوە یان وا رێك دەکەوێت یاسایەك چارەسەری رووداوێکی دیاری کراو بکات وەك ئەو یاسایەی بۆ چارەسەری رووداوی لافاوێك لەکاتو شوێنێکی دیاری کراودا بکات.

## ٤- بنچینەی یاسایی لکاوە بەسزایەکی ماددی. دەسەڵاتی گشتی بە سەر سەرپێچی کەردا دەیسەپێنێ

لەڕاستیدا ئەم وەسفە بنچینەی یاسایی لەبنچینەکانی تر جیا دەکاتەوە کە تایبەتن بەدیارکردنی رەوشتی کۆمەڵایەتی.

وەکو بنچینەکانی رەوشتو بنچینەکانی موجامەلات.

دەسەڵاتی تایبەتمەند بەسەپاندنی سزای یاسایی

دەسەڵاتی دادگەری خاوەن دەسەڵاتە بۆ چەسپاندنی یاساو سەپاندنی سزای یاسایی بەڵام وەگو ریزپەڕ (استثناءاً) هەندێ کەس بەپێی یاسا بۆیان هەیە خۆیان سزا بەسەر نەیار (خصم)ی خۆیان بسەپێنن وەك حاڵەتی بەرگری لەخۆکردنی شەرعی هەروەها مافی گل دانەوە (الحق في الحبس). مەبەستمان گلدانەوەی شتە فرۆشراوەکەیە ئەگەر هاتوو کڕیارەکە نرخەکەی نەدا بوو هەروەها دەسەڵاتی راپەڕاندن (السلطة التنفيذية) بۆی هەیە بەپێی یاسا خۆی لەو حاڵەتانەی لەیاسادا هاتوون سزا بسەپێنێت.

## جۆرەکانی سزا:

لەڕوو کاتی سەپاندنەوە سزا دەکرێ بەسزای وقائی و سزای تەئدیب کردن.

هەروەها لەڕووی ناوەڕۆکەوە دەکرێتە سزای دیاری کراوو سزای دیاری نەکراو.

سزای دیاری کراو ئەو سزایەیە کە دیارکراوە. ئەو سزایەش یان سزایەکی تاوانە (جنائی)یان شارستانی (مدنی)یە وەیان تێکەڵاوە لەهەردوو جۆرەکە. واتە سزایەکی تاوان و لەهەمان کاتدا شارستانی یە.

* **سزای تاوان ( الجزءالجنائی )** ئەو سزایەیە کە لەئەنجامی سەرپێچی کردنی یاسای سزا دروست دەبێت و شێوەی سزا (عقوبە) وەردەگرێت.

سزایەکەش یان سزایەکی ئەسڵی دەبێت وەکو سزای لەسێدارەدان یان بەندنشیتی هەمیشەیی یان بەندنشینی کاتی یان حەپس وەیان غەرامە.

یان سزایەکی پاشکۆ دەبێت وەك سزای بێ بەش کردن لەمافە شارستانی یەکان یان بەدەست بەسەردا گرتنی کەرەستە (ادواة)ەکانی تاوان دەبێت.

* **سزای شارستانی:** ئەو سزایەیە کە لەئەنجامی سەرپێچی کردنی بنچینەیەکی یاسا بێ لەیاسای سزادان دروست دەبێت و شێوەی قەرەبوو (تعویض) یان پووچەڵکردنەوەی رێکەوتن (گرێبەند) وەیان ناچار کردنی قەرزار بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکەی وەردەگرێت.

* **سزای تاوان و شارستانی ( سزای تێکەڵاو ):**

واتە کۆبوونەوەی هەردوو سزاکان (سزای تاوان و سزای شارستانی) بەیەکەوە لەیەك سەرپێچیدا بۆ نموونە وەك ئەو تاوانەی کەدەبێتە هۆی زیان گەیاندن بەکەسانێك.

## سەرچاوەکانی یاسا:

مەبەستمان لەسەرچاوەی یاسا لەرووی زمانەوانی یەوە ئەو سەرچاوەیەیە کەیاسا بنچینەکانی خۆی لێ وەردەگرێ. واتە هەموو ئەسڵێك کەبەشداری دروست بوون و هاتنە کایەوەی بنچینەی یاسایی دەکات.

ئەمانەی خوارەوە سەرچاوەکانی یاسان:

### ١- سەرچاوەی مێژوویی:

مەبەستمان ئەو ئەسڵەیە کەبنچینەکانی یاسای لێ گوێزراوەتەوە. بۆ نموونە داب و نەریت هەروەها یاسای رۆمانی دوو سەرچاوەی مێژووییەن بۆ یاسای ناپلیۆن - یاسای شارستانی فەرەنسی- هەروەها یاسای ناپلیۆن سەرچاوەیەکی مێژووییە بۆ یاسای شارستانی میسری وە ئەم یاسایەی دوایی لەتەك بنچینەکانی شەریعەتی ئیسلامی دوو سەرچاوەی مێژوویین بۆ یاسای شارستانی عیراقی.

شایەنی باسە، تا کۆتایی سەدەی هەژدەهەم لەبەشی باکووری فەرەنسا کار بەبنچینەکانی داب (قواعد عرفیه) دەکرا وە لەبەشی باشوریشی کار بەیاسای رۆمانی دەکرا بەڵام لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە ناپلیۆن بۆناپارت لەساڵی ١٨٠٤ یاسای شارستانی فەرەنسی دانا بەسوود وەرگرتن لەبنچینەکانی عورف و یاسای رۆمانی کە لە باکورو باشووری فەرەنسا کاری پێ دەکرا وەك دوو سەرچاوەی مێژوویی.

هەروەها زانای بەناوبانگ عبدالرزاق سەنهوری کاتێك پرۆژەی یاسای شارستانی میسری دانا سوودێکی زۆری لەیاسای شارستانی فەرەنسی وەرگرت وەك سەرچاوەیەکی مێژوویی هەروەها هەمان یاسازان بۆ دانانی پرۆژەی یاسای شارستانی عیراقی گەڕاوەتەوە سەر یاسای شارستانی میسری لەپاڵ بنچینەکانی شەریعەتی ئیسلامی لە(مجله الاحکام) کە لەعیراق تا ئەوکاتە کاری پێ دەکرا وەك دوو سەرچاوەی مێژوویی.

هەروەها پاشای بابلی حامورابی بۆ دانانی یاسا بەناوبانگەکەی کەڵکێکی زۆری لەو داب و نەریتانە وەرگرت کە لەنێو بابلی باو بوو وەك سەرچاوەیەکی مێژوویی.

شایەنی باسە، سەرچاوەی مێژوویی بایەخێکی گرینگی هەیە بۆ لێکدانەوەو شیکردنەوەی بنچینەکانی یاسایی. بۆ ئەم مەبەستە ئەگەر هاتوو بنچینەیەك لەو بنچینە یاساییانە روون و ئاشکرا نەبوون دەکرێ سوود لەسەرچاوە مێژووییەکەی وەربگیرێ بۆ لابردن و نەهێشتنی ئەو لێڵییە.

## ٢- سەرچاوەی لێكدانەوەو شیكردنەوە ( المصدر التفسیري ):

مەبەست لەسەرچاوەكانی لێكدانەوەو شیكردنەوە ئەو لایەنانەیە كەپەیوەندیان پێوەدەكرێ بۆ روونكردنەوەو شیكردنەوەی بنچینەی یاسایی بۆ لابردنی لێڵی لەسەریدا.

بۆ نموونە ئێمە دوو لایەنی لێكدانەوەو شیكەرەوەمان بۆ بنچینەی یاسایی هەیە كە لایەنی یاسازانی (الفقه)و دادگەری (القضاء)ە، ئەوەی شایەنی باسە، بەپێی برگەی سێ لەماددەی یەك لەیاسای شارستانی عیراقی یاسازانیو دادگەری بەدوو سەرچاوەی سیبر داندراون بۆ یاسای عیراقی بەم پێیە ئەگەر دادوەر (القاضي) هەستی بەلێڵیی دەقێكی یاسایی كرد دەتوانێت سوود لەبیروڕای یاسازانانو ئەو بڕیارانە وەربگرێ كەدادگاكان لەوەوپێش دەریان كردوون وە بۆ ئەم مەبەستە مەرج نییە دادوەر تەنیا خۆی بەیاسازانیی نیشتمانی وەیان بڕیاری دادگاكانی ناوەخۆ ببەستێتەوە بەڵكو بۆی هەیە بگەڕێتەوە سەر هی ئەو وڵاتانەی دەرەوەش كەیاساكانیان لەیاساكانی عیراقی نزیكن بەمەبەستی روونكردنەوەو شیكردنەوەی ئەحكامەكان.

بۆ نموونە بەپێی ماددە (٣٠)ی یاسای چاپەمەنی عیراقی ژمارە (٢٠٦)ی ساڵی ١٩٦٨ هەموار كراو هەروەها ماددە (١١)ی یاسای چاپەمەنی هەرێمی كوردستانی عیراقی ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣ نابێ دوای تێپەڕبوونی سێ مانگ لەرۆژی بڵاوبوونەوە و بۆ چاپكراوی خوولەكیو لەكاتی دەستكردن بەدابەشكردن لەچاپكراوی ناخولەكیدا ئەو داوایانەی لەسەرپێچی كردنی حوكمەكانی ئەو یاسایانەدا ببینرێت.

ئەگەر سەرنجی ئەم دەقە بدەین هەست بەلێڵییەك دەكەین ئەویش ئەوەیە ئایا ئەو ماوەیەی كەدیاركراوە ماوەی بەسەرچوونە (مدە التقادم) یان ماوەی سووتانە (مدە سقوط)ە.

بۆیە بۆ لابردنی ئەو لێڵی یەو روونكردنەوەی ئەم بنچینە یاسایی یە دەكرێ دادوەر بگەڕێتەوە سەر بیروڕای یاسازانان وەیان بڕیارەكانی دادگا بۆیە دەكری سوود لەبیروڕای یاسازان عبدالرزاق سەنهوری وەربگیرێ سەبارەت بەلێك جیاكردنەوەی ماوەی بەسەرچوون و ماوەی سووتان لە (الوسيط) بەرگی سێیەم برگەی ٥٩٤ هەروەها بیروڕای عەبدول مەجید ئەلحەكیم لەكتابەكەی (احكام الالتزام) بەشی دووەم لاپەڕە (٣٢٤)دا.

وەیان بڕیارەكانی دادگا سەبارەت بە تەكییفی قانوونی ئەم ماوەیە.

## ٢- سەرچاوەی ماددی- بابەتی (الموضوعي):

بریتی یە لەو كۆمەڵە ئەسڵ و هۆكارە واقعی و هزری یانەی كەبەشداری دەكەن لەدروستكردن و هێنانەكایەوەی بنچینەی یاسایی.

## ئەسڵ و هۆكارە واقعی یەكان:

ئەو ئەسڵ و هۆكارە واقعی یانە ئەوانەن كە دەگەڕێنەوە بۆ خودی مرۆڤ یان ئەو ناوەندە (وسط) سروشتی یەی كەچواردەورەی داوە هەروەها ئەو ناوەندە كۆمەڵا یەتی یەی كەتیایدا دەژیێت، كەواتە هەندێك جار وادەبێت مرۆڤ كاریگەر دەبێت بەسەر دروست بوون و هێنانە كایەوەی بنچینەی یاسایی

بۆ نموونە پیاو بەسروشت بازوویان بەهێزترە لەئافرەت و هەروەها لەوان زیاتر توانای بەرگری لەخۆكردن و دابین كردنی رسقیان هەیە.

پیاو وەكو كاریگەرێكی واقیعی بەشداری كردووە لەهێنانەكایەوەو دروست كردنی بنچینەیەكی یاسایی ئایینی كە خوای گەورە لەسورەتی تەلاق ئایەتی (٦) دەفەرموێ: (الرجال قوامون على النساء) واتە پیاوان كارسازو سەرپەرشتی ژنانن.

هەر ئەم سروشتەی پیاوەش وای كردووە بنچینەیەكی یاسایی لەیاسای باری كەسی عیراقی دروست بێت كە دەڵێ: (نفقة كل انسان في ماله الا الزوجة فنفقتها

على زوجها) واته بژێوی هەر مرۆڤێك لەسەر خۆیەتی تەنیا بژێوی ژن لەسەر مێردەکەیەتی.

هەر بەم مانایەش بنچینەیەکی یاسایی ئایینیمان هەیە خوای گەورە لەسورەتی تەلاق ئایەتی (٦) دەفەرموێ: (اسکنوهن من حیث سکنتم و وجدکم) واتە لەهەر کوێ یەك خۆتان دەژین بەئەندازەی توانای خۆتان جێ و ژیانیان بدەنێ.

هەروەها هۆکارەکانی سروشت کاریگەریەکی زۆری هەیە بۆ دروستکردن و هێنانەکایەوەی بنچینەی یاسایی. بۆ نموونە زاناکان ئەوەیان روونکردۆتەوە کە هۆکاری ئاوو هەوا کاریگەری هەیە بەسەر لێهاتن (اهلیە)ی مرۆڤەوە بۆیە ئەحکامەکانی لێهاتن لەولاتێکەوە بۆ ولاتێ:ی تر جیاوازە بۆ نمونە بەپێی مادده (١٠٦)ی یاسای شارستانی عێراقی ژمارە ٤٠ سالی ١٩٥١ تەمەنی پێگەیشتن (سن الرشد) بە هەژدەسالێ تەواو دیاری کراوە کەچی لەهەندێ ولاتی تردا ئەم تەمەنە بەزیاتر یان کەمتر لەوە دیاری کراوە.

هەروەکو لەسەرەوە وتمان هۆیەکەی دەگەرێتەوە بۆ ئاوو هەواو وەك هۆکارێکی سروشتی کەجێی گومان نییە ئاوو هەوتا لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێك دەگورێ هەر بۆیە تەسەور ناکرێ مرۆڤ لەتەمەنێکی دیاری کراودا لەهەر کوێیەك بێت لێهاتوو بێت هەر ئەمەش وای کردووە ئەحکامەکانی لێهاتن (اهلیە) لەولاتێکەوە بۆ ولاتێ:ی تر جیاواز بێت.

هەروەها هۆکاری ناوەندی کۆمەلایەتی کاریگەریەکی زۆری بەسەر دروست بوون و هێنانەکایەوەی بنچینەی یاسایی هەیە بۆ نموونە لەو شوێنانەی کە بەپێی داب و نەریتیان فرە ژن هێنان باوە دەبینین یاساکانی ئەو ولاتە رێگا بە فرە ژن هێنانی دەدات وە لەو شوێنانەش کە ئەم داب و نەریتە نییە بەلکو هێنانی ژنێك باوە ئەوا یاساکان ئەحکامەکانیان پێچەوانەی ئەوانەی پێشتر دەبێ.

بۆ نموونە یاسای باری کەسیی عیراقی ژمارە ١٨٨ی سالی ١٩٥٩ هەموارکراو لەمادده (٣) برگەی (٤)دا رێگای داوە بە هێنانی زیاتر لەژنێك بەلام دوای وەرگرتنی

ڕەزامەندی دادگا بەم بۆنەیە دەڵی: (نابێت بەبێ ڕێگەدانی دادوەر، لە ژنێك زیاتر بهێندرێت)

بەپێچەوانەی ئەمە لەیاساکانی هەندێك وڵات بەهیچ جۆرێك ڕێگا نادرێ بەهێنانی زیاتر لەژنێك کە هۆی جیاوازی نێوان ئەو ئەحکامانەش دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری ناوەندی کۆمەڵایەتی هەروەکو لەسەرەوە ئاماژەمان بۆی کرد.

شایەنی باسە، قورئانی پیرۆز بڕیاری لەسەرهێنانی زیاتر لەژنێك داوە هەروەکو خوای گەورە لەسورەتی (نساء) لەئایەتی (٣) دەفەرمووێ:(فانکحوا ماطاب لکم من النساء مثنی وثلاث ورباع)، واتە دووان یان سێیان یان چوار ژن مارەی بۆ خۆتان بکەن.

## ئەسڵ و هۆکارەکانی هزری:

ئەو ئەسڵ و هۆکارە هزریانەی کەبەشداری دەکەن لەدروست کردن و هێنانەکایەوەی بنچینەی یاسایی ئەسڵ و هۆکاری سیاسی و ئابووری و ڕەوشتن.

هۆکاری سیاسیی کاریگەرییەکی زۆری بەسەر یاساوە هەیە چونکە بنچینەی یاسایی تەعبیر لەئەیدیۆلۆژیای دەسەڵاتی حوکمڕان دەکات بۆیە بنچینەکانی یاسایی لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێك بەپێی ئەیدیۆلۆژیای دەسەڵاتی حوکمڕانانی ئەو وڵاتانە دەگۆڕێ.

هەروەها هۆکاری ئابووری دەبێتە هۆی دروست بوون و هێنانەکایەوەی بنچینەی یاسایی چونکە بنچینەی یاسایی لە هیچ وڵاتێکدا دوور لەهۆکاری ئابووری دروست نابێت بۆ نموونە ئەو وڵاتانەی کەخاوەنی سیاسەتێکی ئابووری ئازادن لەڕێگای یاساکانیانەوە ئەوپەڕی ئازادی بەبازرگانەکان ئەدەن و تەعبیر لەو وتەیە دەکەن کەدەڵێ:(لێی گەڕێ با بڕوا... لێی گەڕێ با کار بکات).

بەڵام ئەو وڵاتانەی کەخاوەنی سیاسەتێکی ئابووریی ئاراستەکراون (الاقتصاد الموجه) ئەو سیاسەتە ئابوورییە لەنێو یاساکانی ئەو وڵاتەدا تیشك دەداتەوە چونکە

یاسا تیشك دانەوەی ئەو هزرو بەرژەوەندییە ئابووریانەیە کە لەناو کۆمەڵدا هەیە بۆیە دەبینین لەو وڵاتانەدا بەپێچەوانەی وڵاتانی پێشوو لەڕێگای یاساوە دەوڵەت دەست لەگشت وەیان زۆربەی بوارە جیاجیاکانی چالاکی ئابووری وەردەدات. بۆیە دەبینین لەو وڵاتانەی کەبەرەو سۆسیالیزم هەنگاو دەنێن لەڕێگای یاساوە هەندێک کۆت خراوەتە سەر مافی موڵکدارێتیو ئەو مافە بەفەرمانێکی کۆمەڵایەتی داندراوە نەك مافێکی رەها هەروەکو لەبڕگەی (ا) لەمادده (١٦)ی دەستووری عێراقی ساڵی ١٩٧٠ هاتووە.

## ئەسڵو هۆکاریی رەوشت:

ئەوەی شایەنی باسە، زۆربەی بنچینەکانی رەوشت رەگیان دەگەڕێتەوە بۆ ئایین هەروەها ئەو بنچینانەش -بنچینەکانی رەوشت- بەدەوری خۆیان هۆکارێکی کاریگەرن بۆ هێنانەکایەوەو دروستکردنی بنچینەی یاسایی. بۆ نموونە بەپێی بنچینەکانی رەوشت درۆکردنو کوشتنو ئازاردانی خەڵكو دزیو راوو رووتیو زیان پێ گەیاندنو بەڵێن شکاندن نەفرەتیان لێ کراوەو کاری خراپن.

دەبینین ئەم بنچینانەی رەوشت بەشداریان کردووە لەدروستکردنو هێنانەکایەوەی بنچینەی یاسایی.

بۆ نموونە بەپێی مادده (٢٠٢)ی یاسای شارستانی عێراقی ژمارە ٤٠ ساڵی ١٩٥١ هەر کردەوەیەکی زیانبەخش بەنەفس چ کوشتن یان زامدار بوون یان لێدان وەیان هەر جۆرێکی تری ئەزیەتدان بێت دەبێتە هۆی زۆر لێکردنی لەو کەسەی زیانەکەی کردووە قەرەبووی ئەو زیانە بکات.

لەم بنچینە یاساییەی سەرەوەدا کاریگەرێتیی هۆکاری رەوشتمان لەسەر بنچینەی یاسایی بۆ دەردەکەوێت.

ئەوەی شایەنیباسە، بێ لەو هۆکارانەی سەرەوە گەلێك هۆکاری تریش هەن کە کاردەکەنە سەر دروست بوونو هاتنە کایەوەی بنچینەی یاسایی وەك هۆکاریی ئایینو موجامەلە.

## سەرچاوەکانی یاسای عیراقی:

بەپێی مادده (١)ی یاسایی شارستانی عیراقی سەرچاوەکانی یاسای عیراقی بریتین لەدوو کۆمەڵە. کۆمەڵەی یەکەم سەرچاوە سەرەکییەکان پێك دەهێنن کە پێك دێن لە(تەشریع و، داب، بنچینەکانی شەریعەتی ئیسلام بێ گوێ دانە مەزهەبێکی دیاری کراو، هەروەها بنچینەکانی دادپەروەری).

کۆمەڵەی دووەمیش سەرچاوە ناسەرەکییەکان پێك دەهێنن بریتین لەئەحکامەکانی دادگاو یاسازانی عیراقی و دواتریش یاسازانی ئەو وڵاتانەی کەیاساکانیان لەیاسای عیراقی نزیکە. کەواتە بەپێی بەرزی و نزمی پلەیانەوە بەم شێوەیەی خوارەوە ریزیان دەکەین:

١- تەشریع.

٢- داب( عورف).

٣- بنچینەکانی شەریعەتی ئیسلامی.

٤- بنچینەکانی دادپەروەری.

٥- ئەحکامەکانی دادگا.

٦- یاسازانی (الفقه).

شایەنی باسە، دادوەر استثناء دەکرێ لەتۆبزی لێکردن بۆ پەنابردنە بەر بێ لەتەشریع بۆ رووداوە سزاییەکان هۆی ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ برگەی (ب) لەماددەی (٢٧)ی دەستووری عیراقی تەمموزی ١٩٧٠ کە دەڵێ:(هیچ تاوانێك و هیچ سزایەك نییە تەنیا بەپێی یاسا نەبێت..).

ئەو سەرچاوانەی لەسەرەوە ناومان هێنان دەکرێن بەدوو کۆمەڵەی سەرەکی و ناسەرەکی هەروەکو لەپێشەوە ئاماژەمان بۆی کرد.

چوار سەرچاوەکەی یەکەم سەرەکین و دوانەکەی دواییش ناسەرەکین. لەخوارەوە لەدوو خاڵدا باس لەو سەرچاوانە دەکەین.

لەخاڵی یەکەم تیشک دەخەینە سەر سەرچاوە سەرەکییەکان و لەخاڵی دووەمیشدا سەرچاوە ناسەرەکییەکان.

یەکەم: سەرچاوە سەرەکییەکانی یاسای عیراقی:

# ١- تەشریع:

ئەو کۆمەڵە بنچینە یاساییانەیە کەدەسەڵاتێکی تایبەتمەند دەری کردوون.

تەشریعاتە جیاجیاکان وەکو یەك نین لەڕووی بەهێزی و لاوازییەوە بەپێی جیاوازیان لەڕووی جۆری ئەو بابەتانەی چارەسەریان دەکەن وە بەپێی جۆری ئەو دەسەڵاتەی کەهەڵدەستێ بەدەرکردنیان بەپێی ئەمە تەشریعی بنەڕەتی (دەستوور) لەسەرووی هەموویانەوە دێت، دوای ئەویش تەشریعی ئاسایی (یاساو ئەو بڕیارانەی هێزی یاسایان هەیە) دێت، لەدوای هەمووشیان لقەکانی تەشریع (ئەنزیمەو ڕێنمایی و پەیڕەوی ناوخۆ) دێت.

### خاسیەتەکانی تەشریع:

١- تەشریع بنچینە یاساییەکان دەگرێتە خۆ، کەواتە دەبێ گشت خاسیەتەکانی بنچینەی یاساییان تیا بێت کەلەوەو پێش باسمان کردن.

٢- تەشریع لەشێوەیەکی نووسراو دەردەکەوێت.

لێرەدا جیاوازە لەگەڵ بنچینەکانی تری ڕێکخستنی ڕەوشتی کۆمەڵایەتی کەمەرج نیە بەشێوەیەکی نووسراو بێت.

٣- تەشریع لەلایەن دەسەڵاتێکی تایبەتمەندەوە دەردەچێت. وەئەم دەسەڵاتەش ڕەنگە دەستەیەکی هەڵبژێردراو بێت وەك ئەنجوومەنی یاسادانان یان هەڵنەبژێردراو بێت وەك ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش.

ئەوەی شایەنی باسە، وەك بنچینە ئەنجومەنی یاسادانان دەسەلاتی تایبەتمەندە بەدانانی یاسا، دەسەلاتی جێبەجی کردنیش تایبەتە بەدەرکردنی ئەنزیمەوە رێنمایی‌یەکان هەروەها دەستەیەکی هەلبژێردراو یان هەلنەبژێردراو تایبەتمەند دەبێت بەدانانی دەستوور یان گەل هەلدەستێ بەدەرکردنی لەرێگای ریفراندۆم (استفتاء)ەوە.

## بایەخی تەشریع:

هۆیەکانی بایەخ پێدان بەتەشریع دەگەرێتەوە بۆ ئەمانەی خوارەوە:

١- زۆری لایەنە چاکەکانی‌و کەمی لایەنی خراپەکانی.

٢- بەوەسیلەیەکی گرینگ دەژمێردرێ بەدەست دەسەلات دارانەوە بۆ سەپاندنی ویست‌و ئارەزووی خۆیان بەسەر زۆرینەی خەلك هەروەها زامنی ئیحتکاری دەسەلاتەکان بەدەست دەسەلاتداران لەناو دەولەت دەکات.

٣- لەگەلّ سیستمی دیموکراسی‌یەت دەگونجێ، ئەو سیستەمەی باوەری بەسەروەری گەل هەیە دوابەدوای سەرهەلدانی دەستەی تایبەتمەند بەدەرکردنی یاسا کەلەرێگای ویست‌و ئارەزووی گەلەوە دروست دەبن.

٤- وەسیلەیەکی گرینگە بۆ بریاردانی ماف‌و ئازادی‌یەکانی تاکەکانی کۆمەلّ‌و پاراستنیان.

٥- دەگونجێ لەگەلّ بیروباوەری سۆسیالیزم لەدەست تێوەردانی دەولەت لەرێکخستنی کاروباری خەلك.

٦- لەگەلّ خێرایی پێشکەوتنی کۆمەلّ دەگونجێ بەمەبەستی رووبەروو بوونەوەی ئەو پێشکەوتنە بە پەنابردنە بەر تەشریع بەدانانی هەندێك بنچینە بۆ رێکخستنیان.

٧- وەسیلەیەکە بۆ یەککگرتنەوەی یاساکان لەدەولەتدا.

بۆ نموونە، تا کۆتایی سەدەی هەژدەهەمین بەر لەدەرچوونی یاسای شارستانی فەرەنسی لەسالّی ١٨٠٤ لەلایەن ناپلیۆن بۆناپارتەوە کە هەر بەناوی ئەویشەوە

ناسـراوه، لـەباکوری فەرەنسـا کـار بەبنچینـەکانی داب (عـورف) دەکـرا وە لەبەشـی باشوریشـدا کـار بەیاسـای رۆمـانی دەکـرا. بـەڵام دوای دەرچوونـی ئـەم یاسـایە لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمینـەوە بووە هۆی یـەکگرتنی ئـەو بنچینـە یاساییانەو تەنیا کار بەیاسای ناپلیۆن دەکرا.

٨- دەبێتـە هـۆی یـەکگرتوویی رامیـاریی وڵات. هـەمان نموونـەی سـەرەوە، فەرەنسا دوای دەرچوونی یاسای ناپلیۆن بووە خاوەنی یەکگرتوویی رامیاری خۆی.

٩- هۆکارێکە (کەرەستەیەکە) بۆ چاکردنەوەی کۆمەڵو بەرەو پێشەوە بردنی.

## جۆرەکانی تەشریع:

### یەکەم: تەشریعی سەرەکی (دەستور):

مەبەستمان لەدەستوور ئەو یاسایە سەرەکییەیە کە ئەو بنەمایانە دادەنـێ کـە دەوڵـەتی لەسـەر دادەمەزرێ. دەسـتوور جۆری نیزامی سیاسی دەوڵـەت دیاردەکـات هەروەها شێوەی حکومەتەکەی وەپەیوەندی نێوان دەسـەڵاتە گشتییەکانی هـەروەها دەسـەڵاتەکانیانو مـافو ئەرکـەکانیان. هـەروەها مـافو ئازادییـە گشـتییەکانو ئەرکەکانی تاکەکانی کۆمەڵ دیار دەکات.

بـەم شێوەیە بەیاسـایەکی سـەرەکی دادەندرێـتو بـاڵ بەسـەر نـیزامی کۆمـەڵ دادەکێشێو لەهەموو جۆرەکانی تری تەشریع بایەخی زیاترە.

وە هـۆی ئـەم بایەخـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی ئـەو دەسـەڵاتەی کەدەسـتوور دەردەکات جیایە لەو دەسەڵاتانەی کـەجۆرەکانی تـری تەشـریع دەردەکات، هـەروەها بەهەمان شێوەی ئەو تەشریعاتانە هەموار ناکرێ هەروەها نابێت هیچ تەشـریعێکی تـر دەربکرێت سەرپێچی حوکمێك لەو حوکمانە بکات کەتیایدا هاتووە.

### دووەم: تەشریعی ئاسایی (یاساو ئەو بڕیارانەی هێزی یاسایان هەیە).

ئـەو بنچینـە یاسـاییانەن کەدەسـەڵاتێکی تایبەتمـەند لـەچوارچێوەی دەسـەڵاتی خۆیدا کە لەدەستوور دیاری کراوە دەری دەکات.

شایەنی باسە، ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بەپێی برگەی (أ) لەماددەی (٤٢) لەدەستووری عیراقی بۆی هەیە یاسا هەروەها ئەو بریارانەی کەهێزی یاساییان هەیە دەریکات.

**سێیەم: لقی تەشریع (ئەنزیمەو ڕێنمایی و پەیڕەوی ناوخۆ):**

ئەو بنچینە یاساییانەن کەدەسەڵاتی جێبەجێ کردن (ڕاپەڕاندن) بۆ ئاسانکردنی جێبەجێ کردنی تەشریعی ئاسایی یان بۆ ڕێکخستنی دەزگا گشتییەکان یان بۆ پاراستنی ئاسایش و ڕێکخستنی هاتووچۆ.

**بەکاربوونی بوونی یاسا (نفاذ التشریع):**

هەروەکو لەپێناسەی یاسا بۆمان دەردەکەوێ لەو کاتەوە یاسا دەبێ کە لەلایەن دەسەڵاتی تایبەتمەندەوە دادەندرێ، کەئەم دەسەڵاتە تایبەتمەندەش وەك بنچینە دەسەڵاتی یاسادانانە بەڵام هەندێك جار دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنیش بەم کارە هەڵدەستێ وەك حاڵەتێکی استثناء هەروەکو لەوەو پێش باسمان کرد ئەم دەسەڵاتە لەماوەی پشووی ئەنجومەنی یاسادانان وەیان لەکاتی هەڵوەشاندنەوەیدا هەندێ یاسای پێویست دەردەکات بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەموکوڕیانەی هەن هەروەها هەڵیش دەستێ بەدەرکردنی هەندێ یاسای ئابنەڕەتی (عادی) (ئاسایی) وەك ڕێنمایی و نیزام و پەیڕەوی ناوخۆ.

کەواتە هەر کۆمەڵەیەك لەو بنچینە یاساییانە کە لەلایەن یەکێك لەو دوو دەسەڵاتە (ئەنجومەنە) تایبەتمەندانەوە دەردەچن لەکاتی دانانیانەوە پێیان دەووترێت یاسا.

بەڵام ئەمە مانای ئەوەنییە کە یاسا لەو ساتەوە دەبێ کاری پێ بکرێت و بچەسپێت، بەڵکو دەبێ یاسا بەدوو قۆناغی تردا بڕوات تاوەکو کاری پێ بکرێت و بچەسپێت ئەوانیش قۆناغی مۆرکردن (اصدار)ی یاساو بڵاوکردنەوەی (نشر)ی یاسایە.

لەراستیدا ئەم کردارە (واتە کرداری دەرکردن و بڵاوکردنەوەی یاسا) لەگەڵ تیوری لێک جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان (الفصل بین السلطات) دەگونجێ. ئەو تیوری‌یەی لەلایەن یاسازانی فەرەنسی مۆنتیسکیو داندراوە کە دەڵێ هەرسێ دەسەڵاتە گشتی یەکان وڵات دەبێ لێک جیابن و دەست لە ئیش و کاری یەکتری وەرنەدەن.

مەبەستی ئەم تیوری‌یە ئەوەیە کە دەسەڵاتەکان لەلایەن تاکە کەسێک وەیان دەسەڵا تێکەوە دەستیان بەسەردا نەگیرێ و دیکتاتۆریەت دروست نەبێ.

بۆیە لەجیاتی دەست تێوەردان جۆرە پەیوەندی‌یەک لەنێوان ئەو دەسەڵاتانەوە دەبێ وەک چاودێری کردنی ئیش و کاری یەکتری.

جا بەپێی ئەم تیۆری‌یە دەسە ڵاتی یاسادانان (السلطة التشریعیه) بۆی نیە تۆبزی لە ئەندامانی دەسە ڵا تی جێ بەجێ کردن

(السلطة التنفیذیة) بکات بۆ ئەوەی کار بەو یاسایانە بکەن کە دەسەڵاتی یاسادانان دایان ناوە. بەڵکو دەبی سەرۆکی دەسەڵاتی جێ بەجێ کردن هەڵستێ بەداواکردن و تۆبزی کردن لەئەندامانی ئەنجومەنەکەی بۆ کارکردن بەیاسا ئەمیش لەرێگای مۆرکردنی یاساوە دەبێ. واتە ئەو یاسایەی کە لەلایەن ئەنجومەنی یاسادانانەوە ئامادەکراوە و دەنگی لەسەر دراوە دەنێردرێتە لای سەرۆکی ئەنجوونی جێ جێ‌کردن (راپەڕاندن)ەوە بۆ ئەوەی مۆری بکات.

بەڵام ئەمەش بەس نییە بۆ ئەوەی یاسا کاری پێ بکرێ بەڵکو دەبێ ئەحکامەکانی یاسا بگەیەندرێنە بەرچاو و گوێی هاووڵاتیان تاوەکو ئاگاداری ناوەڕۆکەکەی بن کەئەمەش لەرێگای بڵاوکردنەوەی یاساوە ئەنجام دەدرێت.

سەبارەت بەزەرورەتی بڵاوکردنەوەی یاسا خودای گەورە لە هەردوو دەقی ئایەتی ١٥١ و ٢٤٢ی سورەتی بەقەرەدا بڕیاری لەسەر ئەم پرنسیپە (پرنسیپی بڵاوکردنەوە)، داوە بەو مەبەستەی بنچینەکانی یاسای ئیسلامی بگاتە بەر دەست و دیدو هۆشی خەڵکی

لەئایەتی (١٥١) ی سورەتی بەقەرەدا دەفەرموێ ( كما ارسلنا فیكم رسولا منكم یتلوا ایتنا و یزكیكم ویعلمكم الكتب والحكمە ویعلمكم مالم تكونوا تعلمون)

واتە هەروەکو پێغەمبەرێکمان لەخۆتان بۆ ناردوون تا نیشانەکانی ئێمەتان بۆ بخوێنێتەوەو ئێوە پاك بكاتەوە، وە قورئان و حیکمەت و هەرچی نایزانن فێرتان بکا،

هەروەها لەئایەتی (٢٤٢)ی هەمان سورەتدا دەفەرموێ: (كذلك يبين الله لكم ايته لعلكم تعقلون).

واتە بەم جۆرە خۆتان بخەنەکارو بیربکەنەوە.

ئەوەی شایەنی باسە، بلاوکردنەوە کارێکی پێویستە بۆبەکاربوونی یاسا جا چی ئەو یاسایە یاسایەکی بنەڕەتی (اساسی) بێت وەك دەستوور وەیان یاسایەکی نابنەڕەتی واتە ئاسایی (عادی) بێت وەك یاساو ئەو بڕیارانەی هێزی یاسایان هەیە وەیان لقەکانی یاسابن وەك ڕێنمایی و نیزام و پەیڕەوی ناوخۆ.

لەئەسڵدا هەموو شتێ ڕێگا پێدراوە (الاصل في الاشياء الاباحە) بەلام دوای ئەوەی تاکەکانی کۆمەڵ ڕێکەوتنێکیان لەگەڵ یەکتریدا بەستووە کەپێی دەڵێن، ڕێکەوتنی کۆمەلایەتی (العقد الاجتماعی) هەریەکێك لەوانە وازی لە هەندێك مافی خۆی بۆ ئەوانی تر هێناوە تاوەکو بەرژەوەندی یەکانیان بەگژیەکدا نەچێ و بۆ ئەوەی کۆمەڵ ڕێکبخسترێ چونکە ئەگەر ئەمە نە بێ فەوزاو پاشا گەردانی دروست دەبێ.

جا لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کەچۆن مرۆڤ بە ئارەزووی خۆی وازی لەهەندێك مافی خۆی بەپێێ ئەم ڕێکەوتنە هێناوە واتە بازنەی شتە ڕێگاپێدراوەکان وردە وردە تەسك دەبێتەوە تاوای لێ دێ بەتایبەتی دوای دروست بوونی دەوڵەت و پەیدابوونی یاسا وەك هۆکارێکی کاریگەر بەدەست دەسەلا تدارانەوە (الحكام) بۆ سەپاندنی ویست و ئارەزووی خۆیان بەسەر چینی گشتی (المحكومين)دەبینین ئاوە ناوە ئەم بازنەیە تەسك تر دەبێتەوەو زۆر لەو کردارو شتانە بە ڕێگاپێدراوی نامێننەوەو ڕێگانادرێ مرۆڤ بیان کات وە یان بەکاریان بهێنێ بۆ نموونە لەسەردەمی ڕژێمی

پاشایەتی ئێران پۆشین (حجاب) ئەرك نەبوو بۆیە ئەگەر ئافرەتێك ئێرانی بە سفوری لەناو شەقام و شوێنە گشتی‌یەکان بسوڕایەتەوە کارێکی ڕەوابوو چونکە سەرپێچی نیزامی گشتی و ڕەوشتی گشتی ئێرانی نەبوو واتە سەرپێچی (مخالفە)ی بنچینەیەکی یاسای بەرکار (القانون الوضعی)ی ئێرانی نەبوو بەلام دوای شۆڕشی ئیسلامی ئێرانی لەساڵی ١٩٧٩و دوا بەدوای دەرچوونی هەندێك بنچینەی ئاسایی و گۆرانی نیزامی گشتی و ڕەوشتی گشتی لە ئێراندا خۆدا پۆشین (حجاب) بووە ئەرکی سەرشانی ئافرەتان بۆیە دادپەروەری وادەخوازێ کە ئەو جۆرە یاسایانە بەر لەکار پێ کردنیان بەو دوو قۆناغەی سەرەوەدا بڕۆن تا هەموو کەسێك ئاگاداری ئەحکامەکانی بن.

هەروەها ئێستا کەلەکوردستاندا بەپێی مادەی ( < ) لەیاسای چاپەمەنی ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣ سانسۆر لەسەر چاپەمەنیدا نیە بۆیە خاوەن بەرهەمە هزری‌یەکانئازادن لە چاپکردن و بلاوکردنەوەی بەرهەمەکانیان. بەلام ئەگەر هاتوو ئەو یاسایە

هەموار (تعدیل) کرا لەلایەن پەرلەمانی کوردستانەوە نابێ جێ بەجێ بکرێ وەك بنچینە تاوەکو لە ڕۆژنامەی ڕەسمیدا بلاو نەکرێتەوە هەروەکو لەوەبەر ووتمان مەبەستیش لەبلاوکردنەوەیدا ئاگادار کردنەوەی کۆمەڵە بەئەحکامەکانی.

کە دەڵێین دەبێ لەرۆژنامەیەکی ڕەسمیدا بلاوبکرێتەوە مەبەستمان ئەو ڕۆژنامەیە نییە کە زمانحالێ حکومەتە بەڵکو ئەو ڕۆژنامەیەکە بەپێی یاسا تایبەت کراوە بەبلاوکردنەوەی یاسا بەهەرسێ جۆرەکانیەوە.

شایەنی باسە، ڕۆژنامەی ڕەسمی لەعێراقدا ڕۆژنامەی (الوقائع العراقیە)یە هەروەها لەمیسر پیێ دەڵێن (الوقائع المصریە) بەلام لەهەرێمی کوردستان ڕۆژنامەی (پەرلەمان) ڕۆژنامەی ڕەسمی‌یە.

ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین ئەم دوو ڕۆژنامەیەی سەرەوە واتە عیراقی و میسری لەلایەن دەسەلاتی جێ بەجێ کردنەوە لەلایەن وەزارەتی دادەوە دەردەچێ بەلام ئەوەی دوایی لەلایەن پەرلەمانی کوردستان خۆیەوە دەردەچێ.

بلاو بوونەوەي ياسا لەرۆژنامەی رەسمیدا بە گریتە (قرینە)یەکی بنبڕ دادەندێ بۆ ئاگاداریی خەڵکی بەئەحکامەکانی ئەو یاسایەو نابێ پێچەوانەی ئەمە بسەلمێنێن وەك بنچینەیەك ئەمەش پێی دەڵێن بنچینەی بێ ئاگایی لەیاسادا بەعوزر دانادرێ (الجهل بالقانون لایعتبر عذراً) یان بێ ئاگایی لەیاسادا نیە (لاجهل بالقانون).

## بنچینەی بێ ئاگایی لەیاسا بەعوزر دانادرێ:

وەك بنچینەیەك ئەگەر یاسا لەرۆژنامەی رەسمیدا بلاوکرایەوە لەلایەن کەسانەوە ناوەڕۆکەکەی دیار دەبێت بۆیە لەسەر هەموویان دەچەسپێت بەبێ گوێ دانە ئەوەی کامەیان ئاگاداری بوونە یان نا. بلاوبوونەوەی یاسا خۆی لەخۆیدا گەرینەیەکی یاسایی قەتعی‌یە مانای ئەوەیە کەهەموو کەسێك ئاگاداری ئەو یاسایەن و بۆ هیچ کەسێك نی‌یە پێچەوانەی ئەو گەرینەیە بسەلمێنێت.

واتە هیچ کەسێك بۆی نی‌یە بلێ من ئاگاداری یاسا نیم بەهۆی نەخۆشی‌یەوە یان دوورە ولاتیەوە وەیان نەخوێندەواری یان ناشارەزایی لەزمانی ئەو ولاتە.

لەراستیدا کارکردن بەم بنچینەیە دەگەڕێتەوە بۆ زەروورەتی چەسپاندنی یاسا لەسەر هەمواندا بەشێوەیەکی یەکسانی بەمەبەستی راگرتنی نیزامو استقرار لەناو کۆمەڵدا.

ئەگەر هاتوو پێداویستی‌یەکانی ژیانی کۆمەلایەتی وا بخوازێ کەنابێ عوزر بهێندرێتەوە بۆ بێ ئاگایی لەیاسا لەدوای بلاوبوونەوەی لەرۆژنامەی رەسمیدا کەچی دەبینین سەرەرای ئەمەش دوو حالەت لەم بنچینەیە ریزپەڕ (استثناء) دەکرێ کەئەمانەن:

### ١- حالەتی بوونی دەقێکی یاسایی:

ئەگەر هاتوو دەقێکی یاسایی لەناو یاساکەدا هەبوو بەشێوەیەکی روونو ئاشکرا رێگای دابوو بەعوزر هێنانەوە بۆ بێ ئاگایی لەیاسا لەو کاتەدا ئەو کەسەی عوزر

دەهێنێتەوە بۆ بێ ئاگایی لەیاسادا دەکرێ بەپێی ئەو دەقە یاسایی‌یە گوێی لێ بگیردرێت‌و کار بەو دەقە بکرێ.

هەندێ وڵات لەسنوورێکی یەکجار تەسکدا لەرێگای دەقێکی روون‌و ئاشکراوە بۆ یاساکانی سزا (القوانين الجزائيه) رێگا بەکەسان دەدەن کەعوزر بهێننەوەو پێچەوانەی ئەو بنچینەیەی سەرەوە – بنچینەی بێ ئاگایی لەیاسا بەعوزر داندرێ– بسەلمێنن.

وەک یاسای فەرەنسی سالّی ١٨٧٠ کە ماوەی سێ رۆژی لەبەردەم ئەو کەسانە داناوە بۆ عوزر هێنانەوە لەرۆژی بڵاوبوونەوەی ئەو یاسایەدا.

٢- بارودۆخی نائاسایی (کت‌و پڕ)- (القوه القاهره):

بەو حاڵەتە دەوترێت کەتیایدا مەحاڵە مرۆڤ بتوانێ ئاگاداری بڵاوبوونەوەی یاسا بێت.

بارودۆخی کت‌و پڕ یان نائاسایی حاڵەتێکی گشتی‌یەو بەدوورە لەویست‌و ئارەزوو و توانای کەس.

وەک بارودۆخی شەڕی ناوخۆ یان داگیرکردنی بەشێک لەخاکی وڵات لەلایەن دوژمنەوە یان دابڕانی ئەو بەشە بەهۆی لافاو یان بورکان یان شەق بوونی زەوی یان هەر هۆیەک لەهۆیەکانی لێک دابڕان یان پچڕانی هۆیەکانی پەیوەندی کردن بەیەکەوە.

بۆ نموونە دابڕانی بەشێکی خاکی سوریا لەبەشەکەی تری کەبەرزاییەکانی جولانەو کەوتۆتە ژێر دەسەلاتی زایۆنیزمەوە بەبارودۆخێکی نائاسایی دادەندرێ‌و بەحاڵەتێکی ریزپەڕ دادەندرێ بۆ بنچینەی نائاگایی لەیاسا نی‌یە (لاجهل بالقانون).

هەروەها دابڕانی ئەم بەشەی خاکی کوردستان لەپارچەکانی تری خاکی عیراق لەدوای بەهاری سالّی ١٩٩١ بەحاڵەتێکی ریزپەڕ لەبنچینەی ناوبراو دادەندرێ بۆ مەبەستی چەسپاندنی ئەو یاسایانەی لەلایەن دەسەلاتی ناوەندیەوە دەردەچێت لەسەر هاوولاتیانی کوردی‌نیشتەنی ئەو پارچەیەی کوردستان.

## چەسپاندنی یاسا (تطبيق القانون)

چەسپاندنی یاسا دوای بەرکار بوونی (نفاذە) کۆمەڵێك کێشە دێنیتە ئاراوە سەرووی هەموویانەوە دیارکردنی سنووری ئەو چەسپاندنی لەڕووی کات و شوێن و کەسانەوە دێت.

لەدوو خاڵدا باس لەو مەسەلەیە دەکەین:

### یەکەم: چەسپاندنی یاسا لەڕووی کاتەوە:

یاسای نوێ لەبەرواری جێبەجێ بوونی‌یەوە لەسەر بارو رووداوو کردارە یاسایی‌یەکانی داهاتوو دەچەسپێت و لەسەر هی رابردوو ناچەسپێت کەبەر لەدەرچوون و جێبەجێ بوونی روویان داوە.

لەگەڵ دادپەروەری ناگونجێ مرۆڤ کارێکی رێگا پێدراو لەژێر سێبەری یاسای بەرکار بکات دوایی یاسایەکی نوێ بێت و سزایەك بۆ ئەو کارە دابنێت.

هەروەها ئەم پرنسیپە لەگەڵ پشتگیری کردنی باوەڕدان بەیاساو بەردەوامی مامەڵەکان دەگونجێت.

لەبەر ئەمە دەستووری هەندێك وڵات وەزۆربەی یاسایان بڕیاریان لەسەر ئەم پرەنسیپە داوە لەنێوان ئەو دەستوورانەی ئەم بڕیارانەیان داوە دەستووری عیراقی کارپێکراو( نافذ) دێت کەلەبڕگەی(ب) لەماددەی(٦٧)دا دەڵێ:

(یاسا هیچ ئەسەرێکی کۆنی بۆ نی‌یە مەگەر دەقێکی پێچەوانەی ئەمەی ڕێزپەرە(استثناء) یاسا سزاییی‌یەکان و یاساکانی باج و میرانەی دارایی ناگرێتەوە).

وە هەر بەم مانایە یاسای شارستانی ئێرانی لەماددە(٤)دا دەڵێ:( اثر قانون نسبت به آتیه است و قانون نسبت بەما مقابل خود اثر ندراد ، مگر این که در خود قانون مقرات خاصی نسبت به این موضوع اتخاذ شده باشد).

یەکێك لەئەنجامەکانی ئەو پرنسیپە ئەوەیە کەنابێ دادوەر یاسای نوێ لەسەر ئەو ڕووداوانە بچەسپێنێت کە بەر لەکەوتنە کارەوەیان دێنە کایەوە، بەڵکوو دەبێ یاسای بەکارکەوتوو(القانون النافذ) لەکاتی ڕوودانی ئەو ڕووداوانە بەکاربهێنێ.

بەلاّم هەندێك گیروگرفت دێتە ئاراوە کاتێك هەندێك باری ناتەواو یان ئەوانەی ئاسارەکانیان بەردەوامە لەو کاتەی کە یاسا نوێیەکە دەردەچێت لەکاتێکدا هەندێك لەمەرجەکانی ئەم مەڵبەندە یاسایانە یان هەموی هاتبێتەدی بەلاّم پێش ئەوەی گشت ئاسارەکانی تەواو بووبێت.

واتە ئەم گیروگرفتە لەکاتێکدا دێتە ئاراوە کەبارە یاسایی‌یەکان درێژببنەوە لەژێر سێبەری دوو یاسای جیاواز وەك ئەو ڕووداوو بارانەی کەپێگەیشتنیان کاتێکی زۆری دەوێ وەك بەسەرچوون (التقادم) و ڕاسپاردە(الوصیە) هەروەها ئەو بارانەی کە دروست بوونی ئاسارەکانی کاتێکی زۆری دەوێ وەك ڕێکەوتنی قەرز بەسوو(القرض بفائدة) و ڕێکەوتی هاوسەرێتی(عقدالزواج) لەژێر سێبەری یاسایەك دروست دەبێت و ئاسارەکانیشیان یان بەسەرچوونی تەواو بوونی ئەو ئاسارانە لەژێر سێبەری یاسایەکی تر دروست دەبێت.

کەواتە لەم نموونانەی سەرەوە کامە یاسا دەبێ بچەسپێت؟ ئایا یاسای کۆن لەبەر ئەوەی ڕووداوەکان لەژێر سێبەری ئەو دەستیان بەدروست بوون کردووە، یان یاسای نوێ لەبەر ئەوەی ئەو ڕووداوانە بەخۆیان و ئاسارە کانیشیانەوە لەژێر سێبەری ئەودا تەواو بوونە.

دوو تیوریمان لەم بارەیەوە هەیە کەئەمانەن:

أ- تیووری‌ی کۆن.

ب- تیووری‌ی نوێ.

## تیووری کۆن (النظرية التقليدية):

بەپێی ئەم تیووری‌یە یاسا نوێیەکە دەموو دەست لەسەر ئەو حاڵەتانەی سەرەوەدا دەچەسپێت تەنیا لەوحاڵەتانەدا نەبێت ئەگەر ڕووبەڕووی مافێکی وەدەست هاتوو(حقوق مكتسبه) بۆوە، لەو حاڵەتەدا یاسا نوێیەکە ناچەسپێت بەڵکوو یاسا کۆنەکە دەچەسپێت تاوەکوو یاسا نوێیەکە ئاسارێکی کۆنی نەبێت.

شایەنی یاسا، گشت بەرژەوەندی یەکی دارایی بچێتە ناو ئەستۆی دارایی(الذمة المالية) بەرگری لێ بکرێ بەداوا (دعوا) یان بە دەفع کردن(الدفع) پێی دەوترێ مافی وەدەست هاتوو. هەروەها ئەستۆی دارایی بریتی‌یە لەگشت ئەو شـــتانەی مرۆڤ هەیەتی وەك پارەو خانووبەرەو ئۆتۆمبیل و هەموو شتێکی تر.

بەڵام مافی ودەست نەهاتوو تەنیا هیواو ئاواتەو بەبەرژەوەندی‌یەکی دارایی دانا ندرێ.

ئەم تیۆری‌یە جیاوازی دەکات لەنێوان مافی وەدەست هاتوو لەگەڵ تەنیا هیوا (مجر امال).

بۆ نموونە لەبواری بەسەرچوون(التقادم) و ڕاسپاردن(الوصيه) ئەمەبەدی دەکەین.

لەحاڵەتی یەکەمدا بەپێی یاسای هەندێ وولاتان ئەو کەسەی پانزە ساڵ بەرەو سەرەوە دەست بەسەر زەوی‌یەك دابگرێ بەتێپەڕبوونی ئەو ماوە کەپێی دەڵێ، بەسەرچوونی وەدەستهێنەر(التقادم المكسب) مافی مولْکدارێی بەسەر ئەو زەوی‌یەدا وەدەست دەهێنێ جا ئەگەر یاسایەکی نوێ دەرچوو ئەو ماوەیەی درێژ کردەوە بەر لەوەی بەپێی یاسا کۆنەکە دەچەسپێت نەك یاسا کۆنەکە چونکە مافی ئەو کەسە مافێکی وەدەست هاتوو (حق مكتسب) نییە بەڵکوو تەنها هیوایەك بووە ئەویش ئەوەیە ئەگەر ئەو یاسا کۆنە بەیاسا نوێیەکە هەموار نەکرا بوایە یان نەگۆڕابایە ئەوە بەتێپەڕبوونی پانزە ساڵ ئەو مافەی وەدەست دەهێنا.

لایەنگرانی ئەم تیووری‌یە چوار ڕێزپەڕ(استثناء) یان هێناوەتەسەر پرنسیپی( یاسا بەسەر کۆندا ناچەسپێ – عدم رجعيه القوانين) بەئەسەرێکی کۆن ڕێگای چەسپاندنی

(ل٣٨ كتاب چەمكى ياسا )

هەروەها لە حالەتی دووەمدا، ئەگەر یەكێك وەسیەتی كرد بە بەخشینی نیوەی داراییەكەی بۆ یەكێك بێ لە میراتگرەكانی بەپێی یاسایەك كە رێگای بەمە دابێت، دوایی پاش ماوەیەك ئەو كەسەی وەسیەتی كردبوو مرد، دوای مردنی ئەو یاسایەكی تر دەرچوو رێگای نەدا بە وەسیەتكردنی زیاتر لە سێیەكی میراتەكە. لەم حالەتەدا وەسیەتەكە بە وەسیەتێكی راستو دروستو بەركار (نافذ) دادەندرێت بەپێی یاسا كۆنەكەو یاسا نوێیەكەی لەسەر ناچەسپێ، چونكە مافی وەسیەتبۆكراو (موصی لە) مافێكي وەدەست هاتووە (حق مكتسب) كە لە ئەنجامی مردنی وەسیەتكار (موصی) پێش دەرچوونی یاسای نوێ هاتۆتەدی.

بەڵام ئەگەرهاتوو یاسا نوێیەكە بەر لە مردنی وەسیەتكار دەرچووبێت، ئەوكاتە ئەو یاسایە جێبەجێ دەكرێت نەك یاسا كۆنەكە، چونكە وەسیەتبۆكراو مافەكەی بە مافێكی وەدەستهاتوو داناندرێ تەنها بە مردنی وەسیەتكار نەبێت.

لایەنگرانی ئەم تیۆرییە چوار ریزپەریان لە پیادەكردنی پرنسیپی (( یاسا بەسەر كۆندا ناچەسپێ)) هێناوەتەوە، كە ئەمانەی خوارەوەن:

بەکارهێنانی یاسا نوێیەکەیاندا سەرەڕای ڕووبەڕوو بوونەوەی لەگەڵ مافێکی وەدەست هاتوو لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا:

**١- بوونی دەقێکی ڕوون و ئاشکرا بوو:**

یاسادانەر بۆی هەیە بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا دەقێك لەیاسا نوێیەکە دابنێ بۆ ئەوەی یاسایەکە لەسەر ڕابردوودا بچەسپێت بۆ مەسەلە شارستانییەکان ئەگەر هاتوو بەرژەوەندی گشتی تێدابێت.

لەڕاستیدا ڕێگانەدان بەم ڕێزپەڕە لەدەقە سزاییەکاندا لەگەڵ پرنسیپی (هیچ تاوانێکو هیچ سزایەك بەبێ دەق نابێ) دەگونجێ .

**٢- ئەو یاسا سزاییانەی کەباشترن بۆ تاوانبار:**

ئەو یاسا سزاییانەی کەباشترن بۆ تاوانبار کەهەندێك ئەحکامی باشتر بۆ تاوانبار دەگرێتە خۆ لەسەر ڕابردوو دا دەچەسپێت بەبێ ئەوەی پێویست بەدەقێکی یاسایی تایبەتی بکات.

بۆ نموونە ئەگەر بەپێی دەقێکی یاسای کۆن سزای تاوانێك یەك ساڵ بەندی نشین بێ بەڵام دوای ئەوەو بەرلەوەی تاوانبار لەلایەن دادگاوە دادگاییەکەی تەواو بوو بێو بەو سزایە سزا درابێت، یاسایەکی نوێ دەرچوو ئەو دەقەی یاسا کۆنەکەی هەموار کردو سزایەکی کەمتر کردەوەو کردی بەشەش مانگ گرتن، لەو حاڵەتەدا یاسا نوێیەکە بەسەر تاوانبارەکەدا دەچەسپێ چونکە بۆ ئەو یاسا نوێیە باشترە لەیاسا کۆنەکە.

**٣- ئەو یاسایانەی پەیوەندی یان بەنیزامی گشتییەوە هەیە:**

یاسای نوێ لەسەر ڕابردوودا دەچەسپێ ئەگەر هاتوو پەیوەندی بەنیزامی گشتی و ڕەوشتی گشتییەوە هەبووهەر چەندە لەناو یاساکە دەقێکی ئاشکرا نەبێت کە فەرمان بەوە بکات.

بۆ نموونه ئەگەر یاسایەکی نوێ دەرچوو تەمەنی پێگەیشتن(رشد)ی لەمەژدە ساڵ کردە بیست و یەك ساڵ ئەو کاتە یاسا نوێیەکە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەسەر هەموو ئەو کەسانەی کە نەگەیشتوونەتە ئەو تەمەنە دەچەسپێ بەڵکو لەسەر ئەوانەش دەچەسپێ کە گەیشتوونە تەمەنی پێگەیشتن بەپێی یاسای کۆن.

ئەوەی جێی سەرنجە بەپێی دەستووری عێراقی ئەو یاسایەی پەیوەندی بەنیزامی گشتییەوە هەیە لەسەر ڕابردوودا ناچەسپێ مەگەر دەقێکی ئاشکرا هەبێت فەرمان بەوە بکات.

## ٤- یاساکانی لێکدانەوە( القوانين التفسيرية ):

یاساکانی لێکدانەوە ئەو یاسایانەن کە بۆ ڕوونکردنەوەی حوکمەکانی یاساکانی پێشوو دەردەچن. کەواتە یاسای لێکدانەوە ئەحکامی نوێی تێدانییە بەڵکو ئەحکامەکانی تایبەتن بە لێکدانەوەی یاسای کارپێکراو بۆیە بەبەشێکی تەواوکەری ئەو یاسایە دادەندرێت و لەبەرواری بەکاربوونی یاسا کۆنەکەوە بەرکار (نافذ) دەبێت.

## ٥- یاسا شێوەییەکان ( القوانين الشكلية ):

یاسا شێوەییەکان ئەو یاسایانەن کە پەیوەندیان بە دروست بوونی دادگاکان و دەسەڵاتەکانیان و چۆنێتی بەرزکردنەوەی داواو ئسوولی دادبینینی و ئەو بڕیارانەی کە دەریان دەکەن و دیاریکردنی تانە یاساییەکان و چۆنێتی جێبەجێ کردنیان هەیە.

ئەو یاسایانە لەسەر ڕابردوودا دەچەسپێ بە ئەسەرێکی کۆن وە بۆچەسپاندنی لە عێراقدا بە ئەسەریکی کۆن دەبێ دەقێکی ئاشکرا هەبێ کە فەرمان بەوە بکات.

# تیۆری نوێ:

لایەنگرانی ئەم تیۆرییە دەڵێن دەبێ جیاوازی بکرێ لەنێوان ئەسەری کۆن و ئەسەری ڕاستەوخۆی یاسا. بەپێی ئەم تیۆرییە یاسای نوێ لەسەر ئەو مەڵبەندە

یاساییانە ناچەسپێ کە لەژێر سێبەری یاسا کۆنەکە دروست بوونە یان بەسەر چونە، هەروەها لەسەر ئاسارەکانی ئەو مەڵبەندانەش ناچەسپێ کە لە کۆن دروست بوونە.

بەڵام ئەو مەڵبەندانەی کە لە رابردوودا دروست بوونە چەسپاندنی یاسا نوێیەکە بەسەر رابردوودا ئاسارەکانی ئێستاکەو دوارۆژیشیان چەسپاندنێکی کۆن نییە بەڵکو چەسپاندنێکی بە زوویی‌و راستەوخۆیە، بۆیە هەندێ لەیاسازانان ناوی (ئەسەری بەزوویی‌و راستەوخۆی یاسا)یان لەم تیۆرییە ناوە.

کەواتە چەسپاندنی ئەو یاسایانەی کە تەمەنی پێگەیشتن (سن الرشد)ی ئەو کەسانە زیاد دەکات کە بەپێی یاسا کۆنەکە گەیشتوونەتە بێ ئەوەی بەپێی یاسای نوێ گەیشتبێ‌و دانانیان بەناپێگەیشتوو بۆ کردارەکانی داهاتوویان، بە چەسپاندنێکی زوو بەزوویی یاسا نوێیە دادەندرێ نەك کۆنەکە.

بەڵام ناکرێت ئەو یاسایە لەسەر ئەو کردارانە بچەسپێت کە بەر لەدەرچووندا تەواو بوونە، بۆیە ناکرێ پووچەڵ بکرێنەوە چونکە ئەگەر ئەمە کرا مانای ئەوەیە یاسا نوێیەکە بە ئەسەرێکی کۆن چەسپاوە کە ئەمەش نابێ ببێ.

ئەوەی جێی سەرنجە پرنسیپی ئەسەری زووبەزوویی یاسا بە پرنسیپێکی رەها (مطلق) دانانرێ چونکە مەڵبەندەکانی رێکەوتن (المراکز العقدیە)ی لێ ریزپەڕ دەکرێ کەلەژێر سێبەری یاسا کۆنەکە دروست بوونەو هەتا دوای بەکاربوونی یاسا نوێیەکەش هەر بەردەوامن.

کەواتە ئەم مەڵبەندانەی رێکەوتنە دەکەوێتە ژێر حوکمی ئەحکامەکانی یاسا کۆنەکەی بەپێی پرنسیپی (سلطان الارادە) بەمەرجێك نابێت بنچینەکانی یاسا نوێیەکە لەشێوەی فەرمان بێت‌و پەیوەندی بە نیزامی گشتی‌یەوە هەبێت.

## دووەم: چەسپاندنی یاسا لەرووی شوێن‌و کەسانەوە:

بۆ دیاریکردنی سنووری چەسپاندنی یاسا لەرووی ئەو شوێنەی کە یاساکەی دەچەسپێت وەهەروەها لەرووی ئەو کەسانەی کەبەسەریاندا دەچەسپێت دوو پرنسیپمان هەیە چارەسەری ئەو کێشەیەمان بۆ دەکەن.

## پرنسیپی ناوچەگەرێتی یاسا (مبدا اقلیمیة القوانین):

ئەم بابەتە لەسەر پرنسیپی سەروەری دەوڵەتو دەسەلاتڕۆیی بەسەر هاووڵاتیانو سەربەخۆیی‌یەوە دروست بووە.

بەپێی ئەم پرنسیپە یاسای هەر دەوڵەتێك بەسەر گشت هەرێمەکەی دەچەسپێتو گشت ئەو کەسانەی نیشتەجێی ئەو هەرێمەن هاووڵاتیان بن وە یان بێگانە حوکمەکانی ئەو یاسایە دەیانگرێتەوە.

بە پێچەوانەشەوە لەسەر ئەو ڕووداوانە ناچەسپێ کە لە دەرەوەی سنوورەکەیدا ڕوودەدەن هەرچەندە ئەو ڕووداوانە پەیوەندییان بە هاووڵاتیانی ئەو دەوڵەتەش هەبێت کە لە وڵاتی بێگانەدا نیشتەجێ بوونە.

## پرنسیپی کەسایەتی‌ی یاساکان (مبدا شخصیه القوانین):

بەپێی ئەم پرنسیپە یاسای هەر دەوڵەتێك بەسەر هەموو ئەو کەسانە دەچەسپێت کە هاتوونەتە ڕیزی‌یەوە (واتە پەیوەندیان بە دەوڵەتەوە پەیوەندی ڕەگەزنامەیە) هەرچەندە لە دەرەوەی سنووری هەرێمەکەشی بن وە نابێت لەسەر بێگانەکان بچەسپێت هەرچەندە لە هەرێمەکەشیدا نیشتەجێ بووبن.

لەراستیدا هەردوو پرنسیپ تەواوکەری یەکترن بۆیە ناکرێ کار بە پرنسیپێك بکرێو ئەوەی تریش فەرامۆش بکرێ بۆیە دەبینین لە گشت وڵاتانی دونیا کار بەهەردوو پرنسیپ دەکرێ. شایەنی باسە، وڵاتە نوێیەکان پرنسیپی ناوچەگەرێتی یاسایان بە ئەسڵ داناوە پرنسیپی کەسایەتی یاسایان بەریزپەڕ داناوە. بەلام ئەم ئەسڵەش هەندێك ریزپەڕی دێتە سەر وەك:

١- بوونی دەقێك وا بخوازێ یاسا بێگانەکە (القانون الاجنبی) بچەسپێ، بۆ نموونە کێشەکانی باری کەسیو ئەحکامەکانی تایبەت بە لێهاتن (الاهلیە).

٢- مافە رامیاری‌یەکان لەگەڵ ئەرکە گشتی‌یەکان:

وەك مافی بەشداری كردن لەبەڕێوەبردنی كاروبارەكانی وڵات لەڕێگای فەرمان دیتنو بەشداری كردن لە پرۆسەی هەڵبژاردن بۆ ئەنجوومەنی یاسادانانو ئەنجوومەنی‌تر كە لەڕێگای دەنگادانەوە پێك دێن، هەروەها هەستان بە ئەركە گشتی‌یەكان وەك ئەركی جێبەجێ كردنی گوزارشتی سەربازیو بەرگری كردن لەوڵاتو دانی باجو میرانە یاسایی‌یەكان.

٣- ئەو تاوانەی كە دەرهەق بە بەرژەوەندی‌یە باڵاكانی وڵات دەكرێن وەك ئەو تاوانانەی كە رووبەڕووی ئاسایشی ناوەوەو دەرەوەی وڵات وە یان رژێمە سیاسی‌یەكەی یان یەكێك لە قەواڵە (سندات)ەكانی یان پوولەكانی دەبنەوە.

بۆ نموونە تاوانی لاسایی كردنەوەی پارەی عیراقی واتە وێنە لەسەر گرتنەوەو چاپكردنی دراوی عیراقی لەدەرەوەی وڵات یان لە ناوەوە بە شێوەیەكی نایاسایی.

٤- سەرۆكی وڵاتانو دیپلۆماتاران.

٥- ریزپەڕكردنی هەندێك كەس بەپێی رێكەوتنو پەیمان.

## هەڵوەشانەوەی یاسا:

هەڵوەشانەوەی یاسا واتە كارپێنەكردن بەدەقی یاسا كە لە رێگای كێشانەوەی هێزەكەی دێتەدی.

هەڵوەشانەوەش بە یاسایەكی هاوچەشن یان لەو بەرزتر دەبێت.

جۆرەكانی هەڵوەشانەوە:

بەدوو رێگا یاسا هەڵدەوەشێتەوە: رێگای یەكەم پێی دەووترێ هەڵوەشانەوەی ئاشكرا، رێگای دووەمیش پێی دەوترێ هەڵوەشانەوەی نا ئاشكرا، یەكەم:

هەڵوەشانەوەی ئاشكرا:

هەڵوەشانەوەی ئاشكرا واتە هەڵوەشانەوەی دەقێكی یاسایی بە دەقێكی روونو ئاشكرای یاسایی‌تر.

بۆ نموونە بەپێی ماددەی (١٢٨) لە یاسای جێبەجێ کردنی (تنفیذ)ی عیراقی ژمارە (٤٥)ی ساڵی ١٩٨٠ هەموار کراو یاسای جێبەجێ کردنی ژمارە (٣٠)ی ساڵی ١٩٥٧ هەموار کراو هەڵوەشاوەتەوە.

هەروەها هەندێك جار هەڵوەشانەوەی ئاشکرا دێتە ئاراوە لە ئەنجامی تێپەڕبوونی ماوەی دیاریکراو بۆ بەکاربوونی یاسایەکە. بۆ نموونە بەپێی ماددە (٦)ی یاسای پاکسازی دەزگا میریەکان ژمارە (٢)ی ساڵی ١٩٥٨ ماوەی بەکاربوونی ئەو یاسایە بە شەش مانگ دیارکراوە ئەگەر بۆ هەمان ماوە لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە درێژ نەکرێتەوە.

بۆیە بە تێپەڕ بوونی ئەو ماوەیەو درێژنەکردنەوەی یاسای ناوبراو بە هەڵوەشاوەیەکی ئاشکرا لەقەڵەم دەدرێ.

دووەم: هەڵوەشانەوەی نا ئاشکرا:

هەڵوەشانەوەی نا ئاشکرا واتە هەڵوەشانەوەی حوکمی یاسایەکی پێشین بە یاسایەکی دواتر بەبێ ئەوەی تیایدا ئاماژە بە هەڵوەشانەوەی یاسا پێشینە بکرێت.

واتە لەرێگای بەگژدا چوونی یاسا نوێیەکە لەگەڵ یاسا کۆنەکە ئەمە هەست پێ دەکەین.

وەیان لەرێگای هەستانی یاسا دانەر بەرێکخستنی بابەتێك کە لەوەو پێش بە یاسایەکی پێشتر رێکی خستبوو دەگەینە ئەم دەرئەنجامە.

## کۆکردنەوەی یاسا (تجمیع التشریع):

کۆکردنەوەی یاسا واتە کۆکردنەوەی ئەو بنچینە یاساییانەی تایبەتن بە لقێك لە لقەکانی یاسا دوای دابەشکردنو پۆلێن کردنیان لە کۆرِێك دا.

جۆرەکانی کۆکردنەوە:

### ١- کۆکردنەوەی رەسمی:

بریتی‌یە لە کۆکردنەوەی بنچینە یاساییەکانی تایبەت بە لقێك لە لقەکانی یاسا

لەلایەن دەزگایەکی میری تایبەتمەند وەك یاسای شارستانی عیراقی ژمارە (٤٠)ی سالی ١٩٥١ هەروەها یاسای سزادانی عیراقی ژمارە (١١١)ی سالی ١٩٦٩و یاسای باری کەسایەتی ژمارە (١٨٨)ی سالی ١٩٥٩ هەموار کراو.

**٢- کۆکردنەوەی ناڕەسمی:**

ئەو کۆکردنەوەیەیە کە مرۆڤ پیّی هەلّدەستیّ بەبیّ ئەوەی دەولّەت سیفەتی رەسمی پیّ ببەخشیّ.

بۆنموونە (مرشد الحیران)ی قەدری پاشا کە ئەو بنچینانەی یاسای ئیسلامی گرتۆتەخۆ کە تایبەتن بە مامەلە کردنو باری کەسایەتی.

**میژووی کۆکردنەوەی یاسا:**

جموجۆلی کۆکردنەوەی یاسا تازەنیە بەلکو زۆر کۆنەو دەگەرێتەوە بۆ چاخە کۆنەکان بۆ نموونە دانانی یاسای حامورابی دەگەرێتەوە بۆ دووهەزار سالّ پێش زایین هەروەها یاسای دوانزە تابلۆکە (قانون الالواح الاثنی عشر) دەگەرێتەوە بۆ سالانی نێوان ٤٥٠-١٤٥١ پێش زایین هەروەها کۆکردنەوەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لەسەردەمی خەلیفە ئەبوبەکر رەزای خوای لیّ بێت.

هەروەها یاسای شارستانی فەرەنسی کە ناسراوە بە یاسای نا پلیۆن کە لەسالی ١٨٠٤ دانراوە بە نموونەیەکی زیندووی کۆکردنەوەی یاسا لەچاخی نوێدا دادەندریّ.

# ٢- داب (العرف):

بەو کۆمەلّە بنچینانە دەوترێ کە بەهۆی دووبارە کردنەوەی رەوشتێکی دیاریکراو دێتەکایەوەو دروست دەبێو بڕوایەکی گشتی بە خەلك دەسەلمێنێ کە ئەو بنچینانە سەپاوەنو پەیرەوی کراون.

به واتایەكی تر دەتوانین بڵێین داب بریتی‌یە لە كۆمەڵێك بنچینە كە لە ئەنجامی دووبارە بوونەوەی خۆ بەستنەوەی تاكەكانی كۆمەڵ پێیان لە مامەڵە كردنیان لەگەڵ یەكتریدا لە هەندێك حاڵەتدا بەو وەسفەی كە بنچینەی یاساییەو بەپێی باوەڕی خەڵك هێزی سەپاوەیان هەیە وەك بنچینەكانی یاسا.

لەمەی سەرەوە بۆمان دەردەكەوێ كە داب لە ئەنجامی لێراهاتنو بەردەوام بوونی خەڵك لەسەر ڕەوشتێكی دیاری كراو دێتە ئاراوە كە لەو باوەڕەدان كە ناچارن خۆیانی پێ ببەستنەوە.

شایەنی باسە، تاكو ئێستاش داب لەلایەن هەندێ وڵاتانەوەی لە پێشەوەی سەپاوەكانی تری یاسا دێت بۆ نمونە داب ڕۆڵێكی زۆر گرینگی لە هێناكایەوەی بنچینەی یاسایی لە یاسای ئینگلیزیدا بینیوە.

بۆ نموونە دادوەرانی پادشایەتی بە دوای بنچینەكانی داب دەگەڕانو لە شێوەی پرنسیپی یاسایی لەنێو بڕیارە دادگاییەكانیاندا دایان دەڕشتنەوەو لەكۆی ئەم پرنسیپە گشتی‌یانە یاسای ئەحكامە گشتی‌یەكان پێك دەهات.

هەر لەبەر بایەخی داب هەندێك لەیاسا زانەكان وای بۆ دەچن كە پرنسیپی (بێ ئاگایی لە یاسادا نیە) (لاجهل بالقانون) دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە داب سەرچاوەی یاسایە وە لەبەر ئەوەی بنچینەكانی داب لە ئەنجامی هەڵسو كەوتی تاكەكانی كۆمەڵ دروست بووەو گەشەی كردووە بۆیە وا گریمان (افتراض) دەكرێ كە هەموو كەسێك دەبێ ئاگاداری یاسای وڵاتەكەی بێت.

هەر لەبارەی دابەوە مەعەمەر قەزافی لە كتابە سەوزەكەیدا دەڵێ: (یاسای ئاسایی هەر كۆمەڵگایەك بریتی‌یە لەدابو ئایین.. ئایین بریتی‌یە لە ئامێزگرتنی داب، دابیش تەعبیر لە ژیانی ئاسایی گەلان دەكات.. كەواتە ئایین، كە دابی لە ئامێز گرتووە، تەئكید كردنی یاسای سروشتی‌یە.

كەواتە یاسا نا ئایینیو نادابییەكان (اللادینیە واللاعرفیە) دەسكردی مرۆڤە دژی مرۆڤێكی‌تر، بۆیە پووچەڵە چونكە دوورە لەسەرچاوەی سروشتی كە دابو ئایینە).

**رایەڵەکانی داب ( ارکان العرف ):**

لە پێناسەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێ کە داب دوو رایەڵی هەیە، یەکەمیان رایەڵێکی ماددی‌یە کە بریتی‌یە لە لێڕاهاتنی خەڵك لە رەوشتێکی دیاری‌کراو.

دووەمیشیان رایەڵێکی واتایی‌یە کە بریتی‌یە لە ئەو بڕوایەی لەلای خەڵك دروست دەبێ سەبارەت بە پێویستی پێڕەو کردنی ئەو بنچینەو هەست کردن بە سەپاوێتی.

**یەکەم رایەڵی ماددی:**

بریتی‌یە لە لێراهاتنی خەڵك لەسەر رەوشتێکی دیاری‌کراو لەکاروبارێکی دیاری کراوداو ئەم لێڕاهاتنەش لە ئەنجامی بەدەنگ هاتنی غەریزەی چاولێکەری دروست دەبێت.

بۆ نموونە خەڵکی کوردستان وا لێڕاهاتوونە لەکاتی کڕینی ماست پەنجە دەخەنە ناو ماستو تامی دەکەن ئەوجا دەیکڕن.

<u>مەرجەکانی رایەڵی ماددی:</u>

أ- دەبێ لێڕاهاتنەکە گشتی بێت واتە هەموو کەسێك بگرێتەوە.

ب- دەبێ لێڕاهاتنەکە کۆن بێت.

ج- دەبێ لێڕاهاتنەکە رێكو پێكو دووپات بێت.

د- نابێ لێڕاهاتنەکە پێچەوانەی نیزامی گشتیو رەوشتی گشتیو دەقەکانی یاسا بێت.

**دووەم: رایەڵی واتایی ( الرکن المعنوی ):**

بریتی‌یە لە باوەڕی خەڵك بەوەی کە ئەو لێڕاهاتنە سەپاوەیە بۆ نموونە بەپێی رۆمانی تەنەکە لە نووسینی یەشار کەمال لەشارۆچکەیەکی تورکیا بەپێی دابو نەریتی ئەو ناوچەیە ئەوەی ببایە سەرۆکی یەکەی کارگێڕی‌ی ئەو شارۆچکەیە بە

دۆڵو زوڕنا پێشوازیان لێ دەکردو ئەوەی لەو سەرۆکایەتیەش بکەوتایە بە تەنەکە لێدان بەرێیان دەکرد.

**بنچینەی هێزی سە پاوێتی داب:**

سێ تیۆری لەم بارەیەوە هەن کە ئەمانەی خوارەوەن:

١- تیوری ویستی یاسادانەر:

بەپێی بیروڕای لایەنگرانی ئەم تیوری‌یە ویستی ئاشکرا یان نا ئاشکرای یاسادانەر بنچینەی سەپاوێتی‌ی دابە.

بۆیە داب لە ئەنجامی ڕەزامەندی دەسەڵات لەسەر چەسپاندنی سەپاوە دەبێت.

٢- تیوری دادبینی‌یەکانی دادگا:

بەپێی ئەم تیوری‌یە داب هێزی سەپاوێتی لە دادبینی‌یەکانی دادگا وەردەگرێ.

بۆیە بەر لە دادبینی‌یەکانی دادگا شتێك نیە ناوی داب بێت مەگەر نەریت نەبێ، بۆیە ڕۆڵی دادگا بۆ پێك هێنانی داب وەکو ڕۆڵی دروستکەر وایە لە دروست کردنی کەلوپەل لە کەرەستە خاوەکان.

٣- تیوری‌ی پێویستی‌یە کۆمەڵایەتیەکان:

بەپێی ئەم تیوری‌یە بنچینەی سەپاوێتی‌ی داب دەگەڕێتەوە بۆ پێویستی کۆمەڵایەتی‌یەکان هەروەها ڕەزامەندی هەموان لەسەر چەسپاندنی ئەم ڕەزامەندی‌یەشمان لەپەیڕەو کردنی داب لەلایەن ئەو خەڵکانەوە بۆ دەردەکەوێت.

**گرنگترین لایەنە چاکو خراپەکانی داب:**

<u>لایەنە چاکەکانی:</u>

١- داب تەعبیر لە ویستو ئارەزووی کۆمەڵ دەکات.

٢- داب شان بەشانی بارودۆخی کۆمەڵ دەڕوات.

٣- داب بەسەرچاوەیەکی تەواوکەری یاسای دانراو دادەندرێ.

**لایەنە خراپەکانی:**

١- مەرج نیە هەموو دەمێك ناوەڕۆكی داب روون و ئاشكرا بێت بە پێچەوانەی بنچینەی یاسایی.

٢- كاركردن بەداب دەبێتە هۆی پەیا كردنی فرەنیزامی یاسایی.

٣- داب زۆر لەسەر خۆیە پەرەسەندن و گەشەسەندنیدا بۆیە ناگاتە ئەو پێشكەوتنە خێرایانەی ئەمڕۆ گەلان بەخۆیان دەبینن.

# ٣- بنچینەکانی یاسای ئیسلام:

یاسای ئیسلام بە سەرچاوەیەكی رەسمی سپێر دادەندرێت بۆ هەردوو یاسای شارستانی عیراقی و یاسای باری كەسایەتی بەركار (قانون الاحوال الشخصیه النافذ).

لە بڕگەی دووی ماددەی یەك لە یاسای شارستانی عیراقیدا هاتووە: (ئەگەر دادپرسی دەقێكی لە یاسای دانراودا یا لە دابدا نەدیتەوە كە بۆ چەسپاندن بەسەر مەسەلەكەدا گونجاو بێت ئەوا دەبێ بڕیار بەپێی بنچینە گشتییەكان یاسای ئیسلام دەریكات بێ ئەوەی خۆی ببەستێتەوە بەتاقە مەزهەبێك لە مەزهەبەكانی ئیسلامیەوە).

هەروەها لە بڕگەی دوو لەماددەی یەك لەیاسای باری كەسایەتی عیراقی ژمارە (١٨٨)ی ساڵی ١٩٥٩ هەمواركراودا هاتووە: (ئەگەر دەقێكی یاسای دانراو دەست نەكەوت كە بۆ سەپاندن بگونجێ، ئەوا بەپێی بنچینەكانی یاسای ئیسلام، كە زیاتر دەگونجێن لەگەڵ دەقەكانی ئەم یاسایەدا، بڕیار دەدرێ).

بڕگەی سێیەم لەهەمان ماددە دەڵێ:

(دادگاكان دوای دادگەری (القضاء)و یاسازانی ئیسلامی عیراق و ئەو وڵاتە ئیسلامیانەی یاسایان لەیاسای عیراقەوە نزیكە، دەكەون).

لەم دوو مادەیەی سەرەوەدا ئەوەمان بۆ دەردەكەوێ ئەگەر هات و كێشەیەكی باری كەسی وەیان تایبەت بە مامەڵە كردن بۆ دادگا بەرزبۆوە پێویستە دادگا یەكەم جار پەنا بباتە بەر یاسای نووسراو ئەگەر حوكمێكی تیا نەدۆزیەوە كێشەكەی پێ یەك لا

بکاتەوە ئەوکاتە پەنا دەباتە بەر داب وەك سەرچاوەی دووەمی یاسا ئەگەر لەوێشدا حوکمێکی گونجاوی نەدۆزیەوە ئەوا پەنا دەباتە بەر سەرچاوەی سێیەم کە بنچینەکانی یاسای ئیسلامە وە بۆ گەڕان بەدوای حوکمێکی گونجاو تیایدا نابێ گوێ بداتە هیچ مەزهەبێکی دیاریکراو گرنگ ئەوەیە حوکمێکی گونجاوی دەست بکەوێ بۆ یەك لا کردنەوەی کێشەکە.

ئەوەی شایەنی باسە، لەهەندێ وڵاتاندا پرنسیپەکانی یاسای ئیسلامی بۆتە سەرچاوەیەکی سەرەکیو بنەڕەتی یاسای بەرکار تیایاندا. بۆ نموونە میرنشینی عەرەبی سعودی یەکێکە لەو وڵاتانە.

## ٤- پرنسیپەکانی داد پەروەری ( مبادئ العدالە )

دادپەروەری هەستێکی شاراوەیە لە دەروونیدا سەرچاوەکەی ویژدانێکی زیندووەو مرۆ لە ڕێگای ئەقڵیەوە ئەیدۆزێتەوە بە مەبەستی ئەوەی کە ماف بدرێتە هەموو خاوەن مافێك.

وە لەم پێناسەیەدا ئەوەمان بۆ رون دەبێتەوە کە پەیوەندیەکی زۆر بەهێز لەنێوان پرنسیپی دادپەروەریو یاسای سروشتی هەیە تارادەیەك هەندێ جار وا دێتە بەرچاو کە بەیەکەوە لکابن.

پرنسیپەکانی دادپەروەری بە سەرچاوەی چوارەم لەسەرچاوەکانی یاسا دادەندرێ دوای یاسای نوسراوو دابو بنچینەکانی یاسای ئیسلام دێت لە پۆلێن دا.

ئەمەی خوارەوە دەقی بڕگەی دووی ماددەی یەکە لە یاسای شارستانی عیراقی سەبارەت بەمە:

(ئەگەر دادوەر دەقێکی لەیاسای نوسراو یا لەداب نەدیتەوە کە بۆ چەسپاندن بەسەر مەسەلەکەدا گونجاو بێت ئەوا دەبێ بەپێی بنچینە گشتیەکانی یاسای ئیسلام بڕیار دەربێنێ بێ ئەوەی خۆی ببەستێتەوە بە تاقە مەزهەبێك لە مەزهەبەکانی ئیسلام وە ئەگەر هەر نەیدۆزیەوە بەپێی پرسنیپەکانی دادپەروەری).

ئەوەی شایەنی باسە، زۆرجاران یاسادانەر ڕێگا بە دادوەر دەدات کە بگەڕێتەوە سەر بنچینەکانی دادپەروەری لەو کاتانەی کە سەرچاوەکانی تری یاسا حوکمێکی وایان تیادا نەبێت کە بۆ چەسپاندن بەسەر مەسەلەکەدا گونجاو بێت.

وە مەبەستیش لەمە ڕێگا گرتنە لەبەردەم دادوەر بۆ ئەوەی نەبوونی دەقێکی گونجاو نەکاتە بیانوو بۆ نەدیتنی کێشەکە.

چونکە بەپێی ماددەی (٨) لە جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤ هەموو کەسێك بۆ داوەریکردنو پاراستنی مافە بنەڕەتیەکانی کە یاساو دەستور پێی داوە لە دەستدرێژی کردنە سەر، مافی پەنابردنەبەر دادگە نیشتمانیەکانی هەیە.

## سەرچاوە نا ڕەسمیەکانی یاسای عیراقی:

### ١- یاسا زانی:

بریتیە لە بیروڕای یاسازانو مافناسان لەبارەی ڕوونکردنەوەی حوکمەکانی یاساو بنچینە یاساییە لێڵەکان.

**ڕۆڵی یاسازانی لە یاسا کۆنەکاندا:**

لەسەرەتای سەردەمی یاسای ڕۆمانی یاسازانی تایبەت بوو تەنیا بە کاهینەکان دوایی وردەوردە بۆ کەسانی تریش هەبوو بەم کارە هەستن بەتایبەتی دوای دەرکردنی یاسای دوانزە تابلۆکە.

دادوەر لەم قۆناغەدا ڕاوێژی بە یاسازانەکان دەکردو حوکمی بەپێی ڕاوێژی ئەوان دەدا.

هەروەها لەسەردەمی ڕاستیدا هەندێك لەیاسازانەکان مافی فەتوایان پێ درا دوا بەدوای ئەمە پێنج لەیاسازانەکان فەتواکانیان سەپاوە بوو واتە دەبوایە دادوەر گوێڕایەڵیان بێتو لەسەریان بڕوات.

هەروەها ئیمپراتۆر جوستنیان هەست بە کۆکۆدنەوەی بیروڕای ئەو یاسازانانەو لە کۆدێکا کۆی کردنەوە بەناوی (کۆدی جوستنیان) وە بەم کارەی جوستنیان یاسازانی بووە سەرچاوەیەکی ڕەسمی بنەڕەتی یاسای ڕۆمانی.

شایەنی باسە، یاسازانی رۆڵێکی بەرچاوی نەبووە لەیاسەی ئینگلیزدا چونکە ئەم یاسایە لەلایەك زیاتر بایەخی بە دابو نەریتی سەکسونیو نۆرماندی دەدا لەلایەکی تریشەوە لەسەر بڕیارە پێشینەکانی دادگا (السوابق القضائية) دەڕۆیشت.

**رۆڵی یاسازانی لەیاسای نویدا:**

یاسازانی هێزی سەپاوەی نیە لە یاسانوێکاندا بەڵکو بەسەرچاوەیەکی نارەسمی واتە بەلێکدەرەوەو شیکەرەوە دادەندرێ.

دادوەر لەکاتی چەسپاندنی یاسادا هەروەها یاسادانەر لەکاتی دانانی یاسادا دەگەڕێتەوە بۆ بیروڕای یاسازانەکان ئەگەر مەسەلەیەکی یاسایی لەبەردەمیان روونو ئاشکرا نەبوو بەمەبەستی لابردنی لێڵی لەسەر بنچینە یاساییەکان.

شایەنی باسە، لە عیراقدا دادوەرو یاسادانەر دەگەڕێنەوە بۆ بیروڕای ئەو یاسازانانەی کە یاسای وڵاتەکەیان نزیکە لە یاساکانی عیراقی وە بۆ ئەم مەبەستە لە بڕگەی سێی ماددەی یەکی یاسای شارستانی عیراقی ژمارە (٤٠)ی ساڵی ١٩٥١دا هاتووە دەڵێ:

(لەمانەدا دادگا راوێژو پرنسیپە گشتییانە دەکات کە دادگا بڕیاری لەسەر داون هەروەها بە یاسازانی لە عیراقدا دوایی بە یاسازانی لەو وڵاتانەی کەیاساکانیان نزیکە لە یاساکانی عیراقی).

**٢- دادگەری یان دادوەری (القضاء):**

وشەی (القضاء) لە زمانی عەرەبیدا گەلێك مانای هەیە لەوانە بڕیارەکانی دادگا دەگرێتەوە هەروەها شێوەی دەسەڵاتی دادگایی دەگرێتەوە دواتریش بەمانای ئەو رێبازانە یێت کە دادگاکان بەجۆرێکی هەمیشەیی لە بڕیارەکانیدا دەیگرنە بەر.

(القضاء) بەمانای دوایی سەرچاوەیەکە لە سەرچاوەکانی نارەسمی یاسا.

شایەنی باسە، دادگەری وەك سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی یاسا لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێك دەگۆڕێ:

بۆ نموونە بەپێی یاسای شارستانی عیراقی بەسەرچاوەیەکی نارەسمی واتە لێدەرەوەو شیکەرەوە دادەندرێ کەچی بەپێی نیزامی یاسایی ئینگلیزی بەسەرچاوەیەکی رەسمیو بنەرەتی یاسای ئینگلیزی دادەندرێ.

رۆڵی دادگەری لەیاسا کۆنەکاندا:

دادگەری یان دادوەری بەسەرچاوەیەکی رەسمی یاسا دادەندرا لەلای رۆمانەکانەوە چونکە دادوەر (بریتۆر) لەکاتی دامەزراندنیدا هەندێك رێنمایی (منشور)ی دەردەکرد تیایدا ئەو بنچینانەی دیاردەکرد کە دادبینییەکانی لەسەر بەرێوە دەبرد.

وە لەکۆی ئەو رێنماییانە رێنمایی گشتی (المنشور الدائم) دروست بووەو کاری پێکرا تا ئەوکاتەی کە بە شێوەیەکی رەسمی کۆکرایەوەو ناوی لێنرا (یاسای بریتۆری) هەروەها دوا بەدوای ئەمە لەسەردەمی جوستنیان تێکەڵ بە یاسای رۆمانی کراو یەك یاسای لێ دروست کرا بەناوی (کۆدی جوستینان) (مدونە جستنیان) کە مەبەست لەمە یاسا بەناوبانگەکەی رۆمانییە.

لێرەدا ئەوەمان بۆ رون دەبێتەوە کە یاسای بریتۆری دەستکردی دادوەرەکان بو بەلأم دوای ئەوەی کە رێنمایی بریتۆرەکان کۆکرانەوەو تێکەڵ بە یاساکران لە سەردەمی جوستینان بۆ پێك هێنانی یاسای رۆمانی رۆڵی دادوەر تەنیا چەسپاندنی یاسا بوو نەك دروستکردنی.

هەروەها لە عیراق دادوەری بەپێی برگەی سێی ماددەی یەك لە کۆدی شارستانی عیراقی بە سەرچاوەیەکی نارەسمی واتە لێکدەرەوەو شیکەرەوەی یاسا دادەندرێ.

## فەرمانی یاسا (وظیفة القانون):

فەرمانی یاسا لە ولأتێکەوە بۆ ولأتێك دەگۆڕێ بەپێی ئەو رێچکەیەی کە باوەڕی پێیەتی.

دوو ڕێچکەی سەرەکی لە جیهاندا هەن، یەکەمیان ڕێچکەی تاك پەروەرییە دووەمیشیان ڕێچکەی کۆمەڵ پەروەرییە هەروەها دەتوانین بڵێین ئایینی ئیسلامیش بە ڕێچکەیەکی مام ناوەندی دابنێین لەنێوان ئەم دوو ڕێچکەیە.

بەڵام لەبەرئەوەی یاسای عیراقی ڕێگایەکی مام ناوەندی لەنێوان ئەو دوو ڕێچکەیە گرتۆتە بەر بۆیە لەسێ خاڵدا باس لە فەرمانی یاسا لەو سێ ڕێچکانە دەکەین.

یەکەم: فەرمانی یاسا لەژێر سێبەری ڕێچکەی تاك پەروەر:

ڕێچکەی تاك پەروەر لەسەر بنچینەی ڕێزگرتن لە تاکەکەس (الفرد)و ئازادیەکانی دامەزراوە چونکە بەلای ئەوانەوە تاك تەوەری کۆمەڵەو مەبەستی یاساشە.

بۆیە لە ئەسڵدا هەموو مرۆڤێك ئازادە بەڵام وەك ڕێزپەرێك لەرێگای یاساوە لە تەسکترین سنوردا کۆت دەخرێتە سەر ئەو ئازادیانە.

لایەنگرانی ئەم ڕێچکەیە وای بۆ دەچن کە مرۆڤ هەر لەناو زگی دایکیدا کاتێك کە کۆرپەڵەیە کۆمەڵێك مافی هەیە کە سەرچاوەکانیان سروشتە نەك دەوڵەت وەیان یاسا بۆیە فەرمانی یاسا پاراستنی ئەو مافانەیە کە بەمافی سروشتی ناو دەبردرێت‌و پابەندی سروشتی مرۆڤایەتی مرۆڤن‌و ناکرێ کەم بکرێنەوە چونکە کەم کردنەوەی ئەو مافانە کەم کردنەوەی بەهای مرۆڤایەتی مرۆڤە. کەواتە بەپێی ئەم بۆچوونە ماف بەر لەیاسا هەیەو یاسا تەنیاو تەنانەت بۆ مەبەستی پاراستن‌و پارێزگاری کردن لەو مافانە هاتونەتە کایەوە.

بەبۆچوونی لایەنگرانی ئەم ڕێچکەیە دەوڵەت دەوڵەتێکی پاسەوانەو تەنیا سێ فەرمانی سەرەکی هەیە، یەکەمیان بەرگری کردن لەهەموو هێرشێکی دەرەکی‌و دووەمیان پاراستنی ئاسایشی ناوخۆو سێیەمیشان دەسەڵاتی دادگەرییە. هەروەها هەندێ جاریش دەتوانێت هەستێت بە ڕاپەڕاندنی هەندێك کاری قورس کە لەتوانای تاکەکەسدا نیە وەك دروستکردنی ڕێگاو بان‌و بەنداوو قوتابخانەو نەخۆشخانەکان.

ئەوەی شایەنی باسە، ئەم ڕێچکەیە لە ئەنجامی توندوتیژی دەسەڵاتی فەرمانڕەوای ڕەها (السلطة المطلقة) بەر لە شۆڕشی فەرەنسا دروست بوو.

بەپێی ئەم ڕێچکەیە تاکەکەس بنچینەی کۆمەڵە چونکە کۆمەڵ لەکۆی تاکەکەسەکان پێك دێت بۆیە لەکاتی بەگژیەکدا چوونی بەرژەوەندی تایبەتی کە هی تاکەکەسە لەگەڵ بەرژەوەندی گشتی کەهی کۆمەڵە دەبێ بەرژەوەندی تایبەتی بخرێتە پێشەوەی بەرژەوەندی گشتی چونکە ئەگەر بەرژەوەندی تایبەتی بپارێزرێ ئەوا لە ئەنجامی پاراستنی ئەو بەرژەوەندییە تایبەتیانە بە شێوەیەکی ئوتوماتیکی بەرژەوەندی گشتی پارێزراو دەبێت.

هەروەها هەروەکو وتمان کە ئەوان بەلایانەوە سروشت سەرچاوەی مافەکانی مرۆڤە بۆیە هەر تاکێك لە تاکەکانی کۆمەڵ بەر لەوەی بێتە ناو کۆمەڵەوە کۆمەڵێك مافی هەیە کە سەرچاوەیان سروشتەو لەگەڵ سروشتی مرۆڤایەتیدا دەگونجێ هەروەکو لەوەو پێش باسمان کرد.

کەواتە دەبێ زۆر ڕێز لەو مافانە بگیردرێ هەر بۆیە مافی موڵکدارێتی تایبەتی زۆر جێگای ڕێزە.

ئاکامەکانی ڕێچکەی تاك پەروەر (اثار المذهب الفردي):

ئەم ڕێچکەیە گەلێك ئاکامی لەبواری ڕامیاریو ئابووریو یاساییدا بەدوای خۆیدا ڕاکێشا:

١- ئاکامە ڕامیارییەکان:

دەبێ دەوڵەت مافو ئازادییەکانی تاکەس ڕەها بکاتو هیچ کۆسپو تەگەرەیەکیان نەخاتە بەر. جگە لەو کۆتانەی کە پێویستن بۆ پاراستنی ئازادی کەسانیتر کە ئەو کۆتانەش دەبێ لە تەسکترین سنوردا دابندرێت.

٢- ئاکامە ئابوورییەکان:

دەبێ دەوڵەت زامنی ئازادی کارکردن بکاتو بڕیاریش لەسەر سیستمی ئابووری ئازاد بدات.

واتە کارکردن بەو دروشمەی کە دەڵێ: (لێی گەڕێ با تێپەڕێو لێی گەڕێ با ئیشو کار بکات) (دعه يمر دعه يعمل).

٣- ئاکامە یاساییەکان:

گەلێك ئاکامی یاسایی هەبوو کە گرینگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

ا- کەم بوونەوەی ڕۆڵی یاسا لە ڕێکخستنی کۆمەڵدا.

ب- کەم بوونەوەی بنچینە یاساییە فەرمان کەرەکانو زیادبونی بنچینە یاساییە تەواوکەرو لێکدەرەوەکانی.

ج- پرنسیپی سەروەری دەسەلاّتی ویست (سيادة سلطان الاراده) چونکە وای بۆ دەچن کە ویستو ئارەزووی لایەنەکانی ڕێککەوتن ئازادە لە بەستنو نەبەستنی هەر جۆرە ڕێککەوتنێك یان دانانی هەر مەرجێك.

د- ڕێزگرتن لەمافەکانی تاکەکەسو موڵکدارێتیی تایبەتی.

هـ- بەستنەوەی بەرپرسیارێتیی شارستانی (المسؤوليه المدنيه) بەرەگەزی هەڵەی کەسی (الخطأ الشخصي)یەوە.

واتە بەرپرسیارێتی بەندە بەو هەڵەیەوە کە لەلایەن کەسی بەرپرسیارەوە دەکرێت.

و- دابەشکردنی یاسا بۆ یاسای گشتیو یاسای تایبەتی.

ز- ڕەها کردنی ئازادی کەسی لەبازنەی باری کەسیایەتیدا.

ڕێچکەی کۆمەڵ پەروەر (المذهب الاشتراكي):

بەپێی ئەم ڕێچکەیە مرۆڤ بنچینەی کۆمەڵ نیە بەڵکو هاوکاری کۆمەلاّیەتی بنچینەی کۆمەڵە چونکە مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەلاّیەتییەو ناتوانێ دوور لە کۆمەڵ ژیان بەسەر ببات بۆیە ئەگەر کامەرانی بۆ کۆمەڵ بەدیهات بە شێوەیەکی ئۆتوماتیکی کامەرانی بۆ تاکەکەسیش دێتەدی. کەواتە لە پێناو بەدیهێنانی ئەو کامەرانییە بۆ کۆمەڵ دەبێ تاکەکەس تەرخان بێت بۆ ڕاژەی کۆمەڵ چونکە تاك بەشێکە لە کۆمەڵو لێی جودا نابێتەوە.

کەواتە لەکاتی بەگژیەکدا چوونی بەرژەوەندی تایبەتی‌و بەرژەوەندی گشتی دەبێ بەرژەوەندی گشتی بخرێتە پێشەوەی بەرژەوەندی تایبەتی چونکە ئازادی‌یەکان مافی سروشتی نین بەڵکو فەرمانی کۆمەڵایەتین.

بەم پێیە دەوڵەت بەپێی ئەم رێچکەیە بۆی هەیە دەست لە کاروباری تاک‌ەکەس‌و ئازادی‌یەکانی وەربدات تا ئەو پەڕەکەی.

بۆیە رۆڵی یاسا تەنیا پاراستنی مافەکانی‌و نیزام نیە لەناو کۆمەڵدا بەڵکو ئەم سنوورە دەبەزێنێ بە مەبەستی وە دیهێنانی دادی کۆمەڵایەتی‌و خزمەتگوزاریە گشتی‌یەکان.

ئاکامەکانی رێچکەی کۆمەڵ پەروەر:

ئەمانەی خوارەوە گرنگترین ئاکامەکانی ئەم رێچکەیەن:

أ- ئاکامە رامیاریەکان:

بریتی‌یە لە ئاراستەکردنی ژیانی رامیاری لەناو کۆمەڵدا بەپێی بەرژەوەندی گشتی چونکە ئازادی‌یەکان مافی سروشتی مرۆڤ نین بەڵکو فەرمانی کۆمەڵایەتین.

٢- ئاکامە ئابوریەکان:

دەوڵەت بۆی هەیە دەست لەگشت کەرتە ئابووری‌یەکان وەربدات هەروەها ئاراستەیان بکات‌و بەسەریشیانەوە چاودێر بێت.

٣- ئاکامە یاسایی‌یەکان:

ا- بەستنەوەی بەرپرسیارێتی شارستانی بە رەگەزی زیان پێگەیشتن.

ب- فرەوان بوونی رۆڵی یاسا لە رێکخستنی کۆمەڵدا.

ج- زیادبوونی رۆڵی دەوڵەت لە دەست تێوەردان لە کاروباری کەسایەتی.

د- زیادبوونی بنچینەی یاسایی‌یە فەرمانکەرەکان‌و کەم بوونەوەی بنچینەی یاساییەکانی تەواوکەرو لێکدەرەوە.

هـ- موڵکدارێتی فەرمانێکی کۆمەلأیەتی‌یە (الملكية وظيفة اجتماعية).

و- کەم بوونەوەی ویست‌و ئارەزوو (الارادە) لەبازنەی پەیوەندی کۆمەلأیەتی‌یەکان بۆ نموونە کۆمەڵێك تیوری کۆمەل پەروەر سەریان هەڵدا وەك تیوری لەرتاندنی ماف (اساءة الحق) وتیوری بارودۆخی کت‌و پڕ (الظروف الطارئة)و تیوری ئیستغلال.

ز- روخانی دابەشکردنی یاسا بۆ یاسای گشتی‌و یاسای تایبەتی.

هەلویستی یاسای عیراقی بەگوێرەی هەردوو رێچکەی تاك پەروەرو کۆمەڵ پەروەر:

بۆ ئەم مەبەستە یاساکانی عیراق دابەش دەکەین بۆ سێ قۆناغ

قۆناغی یەکەم بەر لە شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨، قۆناغی دووەم دوای شۆڕشی چواردەی تەموزی ١٩٥٨ تا دەگاتە دەرچوونی دەستووری عیراقی ساڵی ١٩٧٠، قۆناغی سێیەمیش لە دەرچوونی دەستووری عیراقی ساڵی ١٩٧٠ دەست پێدەکات تاکو ئەمڕۆش.

<u>قۆناغی یەکەم: بەر لە شۆڕشی چواردەی تەموزی ١٩٥٨:</u>

لەم قۆناغەدا پەیڕەوی رێچکەی تاك پەروەری دەکرا لە عیراقدا بۆیە زۆر بەزەقی بیرۆکەی تاك پەروەری لە یاساکانی ئەم قۆناغەدا بەدی دەکەین بۆ نموونە یاسای شارستانی عیراقی ژمارە (٤٠)ی ساڵی ١٩٥١ کە بە دایکی گشت یاساکان ناسراوە سەرەڕای ئەوەی کە لەسەر بنەمای دەسەلأتمەندێتی‌ی ئارەزوو (سلطان الارادة) دروست بووە کەچی هەندێك پرنسیپ‌و بیرۆکەی کۆمەڵ پەروەری گرتۆتە ئامێزەوەك پرنسیپی لەرتاندنی ماف‌و تیووری بارودۆخی کت‌و پڕو هەروەها تیووری ئیستغلال.

<u>قۆناغی دووەم دوای شۆڕشی چواردەی تەمووزی ١٩٥٨ تاکو دەرچوونی دەستووری عیراقی لە ١٩٧٠/٧/١٦.</u>

لەم قۆناغەدا گەلێك یاسای وادەرچوون كە مۆركێكی كۆمەڵ پەروەریان بەزەقی پێوە دیاربوو لەوانە یاسای چاككردنی كشتوكاڵ.

قۆناغی سێیەم: دوای دەرچوونی دەستووری عیراقی ساڵی ١٩٧٠.

لەم قۆناغەدا عیراق هەنگاوی بەرەو بەدیهێنانی كۆمەڵ پەروەری نا وە بۆ ئەم مەبەستە كۆمەڵێك یاسای دەركرد كە لەسەر بیرۆكەی كۆمەڵ پەروەری دامەزرابوون كە لەسەرووی هەموویانەوە دەستوور دێت كە لەمادده (١)دا دەڵێ:

(عیراق كۆمارێكی دیموكراسی جەماوەرییەو خاوەن دەسەڵاتی سەربەخۆیە ئامانجی سەرەكی بەدیهێنانی دەوڵەتی یەك پارچەی عەرەبەو دامەزراندنی رژێمی كۆمەڵ پەروەرییە).

هەروەها لە مادده (١٠)دا دەڵێ:

(هاوكاری كۆمەڵایەتی بنچینەی یەكەمی كۆمەڵە...)

وە لەمادده (١٦)دا هاتووە:

(موڵكدارێتی فەرمانێكی كۆمەڵایەتییە لەسنووری ئامانجەكانی كۆمەڵو بەرنامەكانی دەوڵەتدا بەپێی یاسا بەكار دەهێندرێت).

هەروەها كۆمەڵێك یاسای تریش لەم بارەیەوە دەرچوون كە لەهەموویان دیارتر یاسای چاككردنی نیزامی یاسایی (قانون اصلاح النظام القانوني) ژمارە (٣٥)ی ساڵی ١٩٧٧.

ئەم یاسایە كۆمەڵێك پرنسیپی دیاری كرد كە دەبێ یاسادانەر (المشرع) لەكاتی دانانو گۆڕینی (هەموارگردن)ی یاساكاندا لەسەریان بڕوا تاوەكو یاساكان دادی كۆمەڵایەتی بەدی بهێننو فەرمانێكی كۆمەڵایەتیش ببینن.

هەڵوێستی بیرۆكەی تاك پەروەرو بیرۆكەی كۆمەڵ پەروەر لە دابەشكردنی یاسا بۆ یاسای تایبەتیو یاسای گشتی:

مێژووی دابەشکردنی یاسا بۆ یاسای گشتیو یاسای تایبەتی دەگەڕێتەوە بۆ یاسای رۆمانی. بە پێی بیروڕای یاسازانانی رۆمانی یاسای گشتی ئەو یاسایەیە کە ئامانجی سەرەکی بەدیهێنانی بەرژەوەندی گشتییە، یاسای تایبەتیش ئەو یاسایەیە کە ئامانجەکەی هێنانەدی بەرژەوەندی تایبەتییە بەم پێیە رۆمانەکان یاسای گشتییان بە یاسای دەوڵەت داناوەو یاسای تایبەتیش بەلایانەوە یاسای تاکەکەس بووە.

ئەڵمانو ئینگلیزەکانیش ئاگاداری ئەم دابەشکردنە نەبوون بۆیە بەلایانەوە یاسا یەك جۆر بوو.

هەروەها فەرەنساییەکان بەر لە شۆڕشی فەرەنسا ئاگاداری ئەم دابەشکردنە نەبوون بەڵام دوای شۆڕشی فەرەنسا هەستان بە دابەشکردنی یاسا بۆ یاسای گشتیو یاسای تایبەتی.

شایەنی باسە فەرەنسییەکان جیاوازیان لەنێوان دوو حاڵەتی بەشدار بوونی دەوڵەت یان کەسە واتاییە گشتییەکان لە پەیوەندییە یاساییەکان دەکرد. حاڵەتێك کە دەوڵەت یان یەکێك لەکەسە واتاییە گشتییەکان بە سیفەتی خاوەن دەسەڵاتو سەروەری لایەنێك بێت لەلایەنەکانی پەیوەندییە یاساییەکان، حاڵەتێکیش کە دەوڵەت یان کەسە واتاییە گشتییەکان (الاشخاص المعنویه العامه) وەك کەسێکی ئاسایی لایەنێك بێت لەو پەیوەندییە نەك بەسیفەتی خاوەن دەسەڵاتو سەروەری.

بۆیە پەیوەندی یە یاساییەکان لە حاڵەتی یەکەمدا بەپێی یاسای گشتی رێك دەخستران بەڵام لەحاڵەتی دووەمدا بەپێی یاسای تایبەتی رێك دەخستران.

پێوەرەکانی دابەشکردنی یاسا بۆ یاسای گشتیو یاسای تایبەتی:

چوار پێوەری سەرەکیمان هەیە بۆ لێك جیاکردنەوەی هەردوو جۆرەکەی یاسا لە یەکتری کە ئەمانەی خوارەوەن:

<u>یەکەم:</u> سروشتی بەرژەوەندییەکە (طبیعة المصلحة): بەپێی ئەم تیۆرییە یان پێوەرە بەپێی سروشتی ئەو بەرژەوەندییەی کە یاسا دەیپارێزێت بڕیار دەدەین کە ئایا ئەو یاسایە یاسای گشتییە یان یاسای تایبەتی.

بۆ نموونە ئەگەر ئەو بەرژەوەندییەی کە یاسایەکە دەیپارێزێ بەرژەوەندییەکی گشتی بوو ئەوا یاساکەش یاسای گشتی دەبێت، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر بەرژەوەندییەکە تایبەتی بوو ئەوا یاساکەش تایبەتی دەبێت

دووەم: بەرژەوەندی دارایی: بەپێی ئەم پێوەرە ئەگەر هاتوو ئەو بەرژەوەندییەی کە یاسایەکە دەیپارێزێ بەرژەوەندییەکی دارایی بوو ئەوا یاساکە یاسای تایبەتی دەبێت بەلآم ئەگەر بەرژەوەندییەکە نادارایی بوو ئەوا یاسایەکە یاسای گشتی دەبێت.

سێیەم: پێوەری شێوەیی: بەپێی ئەم پێوەرە جۆری یاسا دەگۆڕێ بەپێی سروشتی بنچینە یاساییەکان.

چونکە سروشتی بنچینە یاساییەکانی یاسای گشتی فەرمانکەرە (امرە) بەلآم سروشتی بنچینە یاساییەکانی یاسای تایبەتی تەواوکەرو لێکدەرەوەیە (مکملە ومفسرە).

چوارەم: پێوەری کەسایەتی: بەپێی ئەم پێوەرە جۆری یاسایەکە پابەندی ئەو لایەنانەی رێکەوتنەیە کە یاسایەکە رێکی دەخات.

ئەگەر لایەنەکانی ئەو رێکەوتنە کەسی سروشتی بوون ئەوا یاسایەکە یاسای تایبەتییە بەلآم ئەگەر ئەو لایەنانە کەسی واتایی گشتی یان دەوڵەت بوون ئەوا یاسایەکە یاسای گشتییە.

**بایەخی دابەشکردنی یاسا:**

دابەشکردنی یاسا بۆ یاسای گشتیو یاسای تایبەتی گەلێك بایەخی هەیە ئەمانەی خوارەوە گرینگترینیانە:

١- یاسای گشتی ئامانجەکەی پارێزگاری کردنە لە نیزامی گشتی واتە پاراستنی بەرژەوەندی‌یە بالأکانی کۆمەڵ بۆیە گشت بنچینە یاسایی‌یەکانی فەرمانکەرن‌و نابێ سەرپێچی‌یان لێ بکرێت وەیان رێکەوتنێکی دژ بە ئەوان ئەنجام بدرێت.

٢- یاسای گشتی هەندێك دسەلأت بەدامو دەزگاکانی دەوڵەت دەدات کە یاسای تایبەتی بە کەسانی نادات. بۆ نموونە بەپێ‌ی یاسای گشتی دەوڵەت بۆی هەیە بە زۆری مافی موڵکداریتی لەخاوەنەکەی بسێنێتەوە وەیان ئەو رێکەوتنەی لەگەڵ کەسێکی سروشتی بە ستوویەتی بە ئارەزوویەك یەك لایەنە هەڵی بووەشێنێتەوە.

٣- ئەو ئەحکامانەی کە دارایی‌یە گشتی‌یەکان (الاموال العامە) رێك دەخەن جیاوازن لەو ئەحکامانەی کە دارایی‌یە تایبەتی‌یەکان رێك دەخەن، بۆ نموونە ماوەی بەسەرچوونی دۆرینە (التقادم المسقط) بە گوێرەی جۆری دارایی‌یەکە دەگۆڕێ‌و واش باوە کە ماوەی بەسەرچوونی دۆرینەری مافی داواکردنی دارایی‌یە گشتی‌یەکان درێژترە لە ماوەی بەسەرچوونی دۆڕێنەری دارایی‌یە تایبەتی‌یەکان.

٤- یاسای گشتی پەیوەندی دەوڵەت بە فەرمانبەرەکانیەوە رێك دەخات‌و یاسای تایبەتیش پەیوەندی نێوان کرێکاران‌و خاوەن کارن رێك دەخات.

٥- دادگای تایبەتمەند بە بینینی دادبینی‌یەکان بەپێ‌ی ئەو یاسایە دەگۆڕێ کە دادوەر دەیسەپێنێت.

ئەگەر یاسایەکە یاسای گشتی بوو ئەوا دادگاکەش دادگای کارگێڕی دەبێت وە ئەگەر یاسایەکە یاسای تایبەتی بوو ئەوا دادگاکەش دادگای ئاسایی (العادی) دەبێت.

جۆرەکانی بنچینە یاسایی‌یەکان:

بەگەلێك شێوە یاسا دابەشکراوە، ئەمەی خوارەوە هەندێکە لەو دابەشکردنانە:

١- بنچینە یاسایی‌یەکانی نێو دەوڵەتی‌و بنچینە یاسایی‌یەکانی ناوخۆ.

٢- بنچینە یاسایی‌یەکانی نووسراوو بنچینە یاسایی‌یەکانی نەنوسراوو.

٣- بنچینه یاسایی‌یەکانی بابەتیانه (موضوعیة)و بنچینه یاسایی‌یەکانی شێوەیی (شکلیە).

٤- بنچینه یاسایی‌یەکانی گشتی‌و بنچینه یاسایی‌یەکانی تایبەتی.

٥- بنچینه یاسایی‌یەکانی فەرمانکەرو بنچینه یاسایی‌یەکانی تەواوکەرو لێکدەرەوە.

لەبەر ئەوەی دابەشکردنی یاسا بۆ یاسای گشتی‌و یاسای تایبەتی جێگای بایەخی یاسا زانانه بۆیه ئێمەش به شێوەیەکی چڕوپڕ لێی دەدوێین.

### یاسای گشتی‌و یاسای تایبەتی:

یاسای گشتی بریتی‌یه لەو کۆمەڵه بنچینه یاسایی‌یانەی کە ئەو پەیوەندی‌یە یاسایی‌یانه رێك دەخات کە دەوڵەت یان کەسە واتایی‌یە گشتی‌یەکان لایەنێکن لە لایەنەکانی بەو سیفەتەی کە خاوەن دەسەڵات‌و سەروەرین.

## لقەکانی یاسای گشتی:

یاسای گشتی گەلێك لقی هەیە ئەمانەی خوارەوە دیارترین‌و گرنگترینی ئەو لقانەن:

١- یاسای گشتی نێو دەوڵەتی:

یاسای گشتی نێو دەوڵەتی بریتی‌یە لەو کۆمەڵە بنچینە یاسایی‌یانەی کە پەیوەندی نێوان دەوڵەتان لە باروودۆخی ئاشتی‌و جەنگ رێك دەخات هەروەها پەیوەندی نێوان ئەو دەوڵەتانەو رێکخراوە نێو دەوڵەتی‌یەکان رێك دەخات.

بیروڕای یاسازانەکان لەبارەی سروشتی بنچینەکانی یاسای گشتی نێو دەوڵەتی وەکو یەك نیە، هەندێکیان لەسەرووی هەموویان ئۆستن دێت ئینکاری سیفەتی یاسایی ئەو بنچینانە دەکەن بە بیانووی ئەوە گوایا دەسەڵاتێکی یاسادانان لەسەر

ئاستی جیهان وەك دەسەلاّتی یاسادانان لە هەر ولاّتێك نیە کە ئەو بنچینانەی لێوە دەربچێت.

هەروەها نەبوونی دەسەلاّتێکی بالاّی تایبەتمەند بە چەسپاندنی ئەو بنچینانە لەسەر ئاستی جیهاندا تاوەکو بتوانێ سزا بەسەر سەرپێچی کەراندا بسەپێنێ.

بەلاّم هەندێکی‌تر لەیاسازانەکان وە لەسەرووی هەموویانەوە سافینی دێت دەلێت بنچینەکانی یاسای گشتیی نێو دەولەتی بنچینەی یاساییە.

ئەم کۆمەلە یاسازانانە پاساو بۆ بیروڕای خۆیان دەهێننەوەو لەوەلاّمی بیانووەکانی کۆمەلەی یەکەمدا دەلێن:

نەبوونی دەسەلاّتێکی یاسادانان بەس نیە بۆ ئەوەی ئێمە سیفەتی یاسایی لەسەر بنچینەکانی یاسای گشتی نێو دەولەتی لا ببەین چونکە یاسای نوسراو (التشریع) تاکە سەرچاوە نیە لەسەرچاوەکانی یاسا بەلکو لەپالّ ئەم سەرچاوەیە چەندین سەرچاوەی ترمان هەیە کە لەلایەن دەسەلاّتی یاسادانانیشەوە دەرناچن وەك بنچینەکانی داب‌و بنچینەکانی ئاین‌و بنچینەکانی دادپەروەری‌و بڕیارە پێشینەکانی دادگا (السوابق القضائیة) هەروەها دەلێن نەبوونی دەسەلاّتێکی دادگەری هیچ کارناکاتە سەر بوونی بنچینە یاساییەکان چونکە پیشەی دادوەر چەسپاندنی یاسایە نەك دروستکردن‌و هێنانەکایەوەی یاسا هەروەها زۆر جاران یاسا دەچەسپێت بەبێ گەرانەوە بۆ دەسەلاّتی دادگەری.

## ٢- یاسای دەستووری یان یاسای بنەڕەتی:

بریتی‌یە لە کۆمەلێك بنچینەی یاسایی بنەڕەتی کە نیزامی حوکمڕانێتی لەناو دەولەت دیار دەکات هەروەها چۆنێتی ڕێکخستنی دەسەلاّتە گشتی‌یەکان (مەبەستمان

دەسەلاتی یاسادانانو جیٚبەجیٚکردنو دادگەرییە) هەروەها پەیوەندی هەر یەکێك لەو دەسەلاتە گشتییانە بەوانی ترەوە هەروەها مافو ئازادییە گشتییەکانو ئەرکە گشتییەکان دیاردەکات.

شایەنی باسە، دەستوور دوو جۆری هەیە، دەستووری نەرمو دەستووری وشك.

دەستووری نەرم بەوجۆرە دەستورە دەوترێ کە بەهەمان ڕێگەی یاسای ئاسایی (التشریع العادی) دادەندرێتو هەموار دەکرێتو هەڵدەوەشێتەوە بەلام دەستووری وشك بەو دەستورە دەوترێ کە دانانو هەموارکردنی یاسای ئاسایی واتە دانانو هەموار کردنی زەحمەت ترە لە دانانو هەموارکردنی یاسای ئاسایی.

هەروەها لەرووی دانانەوە دەستورەکان لێك جیاوازن، هەندێك دەستور لەشێوەی بەخششێك لەسەرۆکی ولاتەوە بە هاولاتیان دەبەخشرێ. هەندێکی تریش گەل لەخۆیەوە بۆ خۆی دادەندرێت لە ڕێگای کۆمەڵەیەکی دامەزرێنەر کە لەرێگای هەڵبژاردنەوە ئەندامەکانی هەڵبژێردراون وەیان لە ڕێگای ڕادەبرین (استفتاء) لەسەر ئەو پرۆژەی دەستورە کە حکومەت ئامادەیکردووە.

هەروەها لەهەندێ ولاتدا دەستەیەکی ناهەڵبژێردراو کە حوکمرانێتی ولاتیان گرتۆتە دەست دەستور دادەنێن وەك ئەنجومەنی سەرکردایەت شۆڕش لە عیراق کە دەستوری عیراقی سالی (١٩٧٠)ی داناوە.

### ٣- یاسی کارگێری یان بەرێوە بردن (القانون الاداری):

بریتییە لە کۆمەڵێك بنچینەی یاسایی کە چالاکییەکانی دەسەلاتی راپەراندن لە هەلسان بە فەرمانە کارگێڕییەکەی ڕێك دەخات.

### ٤- یاسای دارایی (التشریع المالی):

بریتییە لە کۆمەلێك بنچینەی یاسایی کە دارایی دەولەت ڕێك دەخات لەرووی داهاتو خەرجییەکانیەوە.

٥- ياساي سزادان (قانون العقوبات):

کۆمەڵێك بنچینەی یاسایی‌یە ئەو کارانە دیار دەکات کە بە تاوان دادەندرێن هەروەها دیاریکردنی سزای هەر تاوانێك لەو تاوانانەو چۆنێتی نەمانی بەر پرسیارێتی.

٦- ياساي دادبینی‌ی سزایی (قانون اصول المحاكمات الجزائیه):

کۆمەڵێك بنچینەی یاسایی‌یە دادگەری سزایی (القضاء الجنائي) رێك دەخات لەگەڵ دەسەڵاتەکانی دادگەری هەروەها کارەکانی ئاشکرا کردنی تاوان‌و چۆنێتی دەسگیرکردنی تاوانبارو لێکۆڵینەوە لەگەڵی‌و دادگایی کردنی‌و جێبەجێ کردنی سزایەکە دیار دەکات.

بە واتایەکی‌تر، بریتی‌یە لە کۆمەڵێك بنچینەی یاسایی ئەوکارانە رێك دەخات کە دەبێ پەیڕەو بکرێ بۆ زامن کردنی چەسپاندنی یاسای سزادان.

## دووەم: یاسای تایبەتی:

یاسای تایبەتی گەلێك لقی هەیە ئەمانەی خوارەوە بەشێکن لەوانە:

١- یاسای شارستانی:

بریتی‌یە لە کۆمەڵێك بنچینەی یاسایی کە پەیوەندی‌یەکانی نێوان کەسان رێك دەخات بێ لەو پەیوەندی‌یانە کە بەپێی لقێکی‌تر لە لقەکانی یاسای تایبەتی رێك دەخسترێن، شایەنی باسە، یاسای شارستانی بەسەرچاوەی گشت لقەکانی تری یاسای تایبەتی دادەندرێ چونکە لەوەوە جیابوونەتەوەو سەربەخۆیی خۆیان وەرگرتووە هەر بۆیە بە یاسای شارستانی دەڵێن دایکی یاساکان وە بە برِبڕەی یاساکان دادەندرێ لەهەر وڵاتێکدا بابەتەکانی یاسای شارستانی لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێك لێك جیاوازە، بۆ نموونە بابەتەکانی یاسای شارستانی عیراقی بریتی‌یە لە

ئەحکامەکانی مامەڵە (معاملات) وەك دیارکردنی واتای دارایی (المال) لەگەڵ جۆرەکانیو هەروەها ئەو مافانەی کە دەکەونە سەر ئەو داراییيانە لەگەڵ چۆنێتی وەدەست هێنانو گواستنەوەو نەمانیان.

هەروەها هەندێك حوکمی تایبەت بە باری کەسایەتی تیایە وەك دیاری کردنی (سن التمیز) و (سن الرشد) چونکە یاسایەکی تایبەتیمان بەباری کەسایەتی لە عیراقدا هەیە ژمارە (١٨٨)ی ساڵی ١٩٥٩ هەموارکراو.

کەچی لە فەرەنسا یاسای شارستانی فەرەنسی ساڵی ١٨٠٤ بە شێوەیەکی یەکسانی بایەخی بە ئەحکامەکانی مامەڵەو باری کەسایەتی داوە.

هەروەها لە عیراقدا بەپێی یاسایەکی تایبەتی مافی دانەر پارێزراوە کەچی لە فەرەنساو یەکێتی سۆڤێتی پێشوو هەروەها روسیا بەپێی یاسای شارستانی ساڵی ١٨٠٤و ١٩٦١و ١٩٦٤ ئەو مافانە پارێزراون.

٢- یاسای بازرگانی:

بریتییە لە کۆمەڵێك بنچینەی یاسایی کە لەسەر بازرگانەکانو کاری بازرگانی دەچەسپێت.

٣- یاسای دادبینییە شارستانییەکان (قانون المرافعات المدنیە):

کۆمەڵێك بنچینەی یاساین کە دەبێ بۆ زامن کردنی چەسپاندنی یاسای شارستانی پەیرەو بکرێن.

٤- یاسای کار:

بریتییە لە کۆمەڵێك بنچینەی یاسایی کە کارو پەیوەندی نێوان کرێکارانو خاوەن کاران رێك دەخات.

٥- یاسای تایبەتی نێو دەوڵەتی (القانون الدولي الخاص):

کۆمەڵێك بنچینەی یاساییيە دادگای تایبەتمەندو ئەو یاسایە دیار دەکات کە دەبێ بەسەر ئەو پەیوەندیانەدا بچەسپێت کە رەگەزێکی بێگانەیان تیایە بۆ نموونە

ئەگـەر پەیوەندیـیەکی یاسـایی لـەنێوان بازرگـانێکی عـیراقیو یـەکێکیتری ئـێرانی دروست بوو وەیان پەیوەندییەك لەنێوان دوو بازرگانی عیراقی لە هەرێمی ئێراندا.

لەو حاڵەتەدا دەبینین هەردوو پەیوەندیی یاساییەکان رەگەزێکی بێگانەیان تیایە لە حاڵەتی یەکەمدا یەکێك لـە لایەنەکانی رێکەوتنەکە بێگانـە لـەهی دووەمیشدا ئـەو هەرێمەی رێکەوتنەکەی لێ بەستراوە بێگانەیە بۆیە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ ئەحکامەکانی یاسـای تایبـەتی نێـو دەوڵـەتی ئـەو یاسـایە ئـەو دادگایـەمان بـۆ دیـار دەکـات کـە تایبەتمـەندە بە بینینـی ئـەو دادبینییـەی کە لـە ئـەنجامی دروسـت بوونـی کێشـەیەك لەنێوان ئەو دوولایەنە دروست دەبێت. هـەروەها ئـەو یاسایەشمان بـۆ دیاردەکات کە دەبێ لەلایەن دادوەرەوە بەسـەر کێشـەکەدا بچەسپێت، واتـە ئایا دادگـای عیراقی یـان ئێرانی کێشـەکە دەبینـێ هـەروەها ئایـا یاسـای عـیراقی یـان یاسـای ئـێرانی دەبـێ بچەسپێت؟

## سروشتی یاسا (طبیعة القانون):

هـەروەکو دەزانین لـەپاڵ بنچینـە یاساییەکان کۆمـەڵێك بنچینـەی تـری رەوشـتی کۆمەڵایـەتیمان هەیـە کـە بایـەخ بـە رەوشـتی تاکەکـەس دەدەن، بـە واتایـەکیتر پەیوەندییـە کۆمەڵایەتیـەکان رێك دەخـەن بەڵام بنچینـە یاساییەکان بـە سـیفەتێکی سەرەکی لە بنچینەکانیتر جیادەبنەوە ئەویش سیفەتی سـەپاوێتییە (الزام). چونکە بنچینـەی یاساییەکان سـەپاوەن بەسـەر تاکـەکانی کۆمـەڵداو نـابێ سـەرپێچیان لێ بکرێت وە ئـەوەی سـەرپێچیان بکـات دووچـاری سـزایەکی مـاددی سـەر دونیـا دەبێـت لەلایەن دەسەڵاتی گشتییەوە.

بۆیـە ئـەم تایبەتمەندێتییـەی بنچینـەی یاسـایی وامـان لێ دەکـات کـە لـە سروشـتی یاسـایی ئـەو بنچینـە یاسـاییانە بکۆڵینـەوەو لەبـەر رۆشـنایی تیۆرییـە شـێوەییو تیۆرییە بابەتیو تیۆرییـە تێکـەڵاوەکان، دواتریش تیۆرییـە کۆمـەڵ پەروەرییـەکان باس لەو سروشتە یاساییە بکەین.

## یەکەم: تیوری‌یە شێوەیی‌یەکان (النظریات الشکلیه):

ئەم تیوری‌یانە بایەخیان بە شێوەی دەرەوەی بنچینە یاسایی داوە بۆیە سروشتی یاسا بە شێوە دەرەکی‌یەکەی دەبەستنەوە.

لەم ڕووەوە دوو تیوری شێوەییمان هەیە، تیوری ئۆستن‌و تیوری ڕاڤەکردن لەبەر ڕۆشنایی دەقەکان (نظرية اوستن ونظرية الشرح على المتون).

### ١- تیوری ئۆستن:

بەپێی بۆچوونی ئۆستن یاسا بریتی‌یە لە فەرمانێکی سەپاوە کەلەلایەن دەسەلاتمەندەوە دەرچووە بەمانایەکی‌تر یاسا بریتی‌یە لەهەندێک فەرمانی گشتی بەردەوام کە ئاراستەی سەرجەم کۆمەڵ کراوە هەندێک جۆری کردارو نەکردنی کرداری تیایە.

پرۆفیسۆر هارت کە یەکێکە لە لایەنگرانی ئەم تیوری‌یە دەڵێ هەر کاتێک یاسایەک هەبێ ڕەفتاری مرۆڤ بەشێوەیەک لەشێوەکان بە شێوەیەکی بەزۆرەکی دەبەسترێتەوە کەواتە بیرۆکەی ئەرک (الالتزام) ناوەڕۆکی بنچینەی یاسایی‌یە.

بەهەرحاڵ دەتوانین بڵێین بەپێی ئەم تیوری یاسا بریتی‌یە لە ویست‌و ئارەزووی دەسەلاتمەندان کە بەزۆری بەسەر تاکەکەساندا دەسەپێنرێت لەکاتی پێویستی‌دا.

کەواتە ڕەگەزەکانی یاسا بریتین لە بوونی دەسەلاتێکی بالا،و دەرکردنی فەرمان‌و نەهی (الامر والنهي) لە دەسەلاتی بالاوە، و لکاندنی ئەو فەرمان‌و نەهی‌یانە بە سزایەکی ماددی سەر دونیا.

بەلای ستنەوە دەسەلاتی گشتی دەکرێ دەستەیەک بێت وەیان تاکەکەسێک بێت بەمەرجێک ئەو دەستەیە حوکمڕانێتی ولاتیان لەئەستۆدا بێت وەیان ئەو تاکەکەسە لەو کەسانە بێت کە لەژێر دەسەلاتی ئەودانە.

بەم پێیە دەتوانین بڵێین ئەو فەرمانو نەهی‌یانەی کە بارزانی نەمر لەکاتی شۆڕشی ئەیلول دەری دەکردن بەمەبەستی قەدەغەکردنی راوو راوشکاری لەوەرزی زاوزێدا هەروەها قەدەغەکردنی راوکردنی بزنەکێویو مامز هەروەها شایی رەشبەڵەك بریتی بوون لە کۆمەڵێك بنچینەی یاسایی لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١- بارزانی نەمر دەسەڵاتی باڵا بوو لەناو شۆڕشی ئەیلولو ئەو ناوچانەی کە کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی شۆڕش.

٢- فەرمانو نەهی‌یەکان گشتیو بەردەوام بوون.

٣- ئەو فەرمانو نەهی‌یانە لکابوون بە سزایەکی ماددی سەر دونیا. واتە ئەو کەسەی سەرپێچی دەکرد لەو فەرمانو نەهی‌یانە دووچاری سزایەکی ماددی دەبوو لەسەر دونیا.

شایەنی باسە، ئۆستن لەسەروی ئەو یاسازانانەوە دەهات کە ئینکاری ئەوەی دەکرد کە بنچینەکانی یاسای گشتی‌ی نێو دەوڵەتی بنچینەی یاسایی بن هەوەکو لەوەو پێش لەکاتی باسکردنی سروشتی یاسا باسمان لێوەکرد.

بەڵام ئەگەر بێتو ئێستاکە لەژێر سایەی سیستەمی جیهانی نوێی ئەمریکا ئەم تیوریە- واتە تیوری‌ی ئوستن- لەسەر ئەو فەرمانو نەواهی‌یانەی کە ئەمریکا دەریان دەکا بچەسپێنن دەتوانین بڵێین گشتیان بنچینەی یاسایین چونکە ئەمریکا تاکە دەوڵەتی زل هێزە لە دونیادا هەروەها ئەو فەرمانو نەواهیانەی کە دەریشیان دەکات لکاون بە سزایەکی ماددی خۆی کەفالەتی سەپاندنیان دەکات بۆ نموونە کاتێك فەرمانی‌یە یۆغسلافیا کرد مافی ئۆتۆنۆمی بدات بە ئەلبانی‌یە موسڵمانە جێنشی‌نیەکانی هەرێمی کۆسۆڤۆ فەرمانەکەی سزای لەگەڵ بوو. ئەوەبوو دوای ئەوەی حکومەتی یوغسلافی گوێڕایەڵی ئەو فەرمانە نەبوو بەبێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ئەنجومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتی بڕیاری لێدانی یۆغسلافیای دەرکردو هێزی ئاسمانیو موشەکی دورهاوێژی دژی ئەو وڵاتە بەکارهێنا.

**٢- تیوریی ڕاڤەکردن لەبەر ڕۆشنایی دەقەکاندا:**

دوای دەرچوونی یاسای شارستانی فەرەنسی کە ناسراوە بە یاسای ناپلیۆن لەساڵی ١٨٠٤ هەندێك لەیاسا زانەکان لە ڕێگای نووسین‌و دانانی کتێب بەمەبەستی ڕێزگرتن لەیاسای ناپلیۆن ئەم بیرۆکەیەیان گەڵاڵە کرد لە ئەنجامدا بووە تیوریی‌یەك‌و بۆماوەیەکی زۆر کاری پێ دەکراو تاکو ئێستاش لایەنگری خۆی هەیە.

بەپێی ئەم تیوریی‌یە دادوەر هەروەها هەموو یاسازانێك‌و ئەو کەسانەی ڕاڤەی یاسایەك دەکەن دەبێ دەق لەدوای دەق ڕاڤەی بکەن بەپێی تەرتیبی ئەو ماددانەی لەناو یاسایەکە هاتوون هەروەها دەبێ بەدوای نیازی یاسادانەر بگەڕێن لەکاتی دانانی یاسایەکە نەك نیازی لەکاتی چەسپاندنی‌دا.

هەروەها ئەم تیوریی‌یە بە تیوری خۆ بەستنەوە بەدەق (الالتزام بالنص) ناوبراوە کەبەر ڕێزگرتنی بێ سنوور بۆ دەقەکانی یاسای نووسراو (التشریع) چونکە ئەو کەسانە دەڵێن تاکە سەرچاوەی یاسا یاسای دانراو (نوسراوە) هەر لەم بارەیەوە یاسازان دمولومب لەوانەکانیدا لەبارەی یاسای ناپلیۆن دەڵێ: (دەق پێش هەموو شتێك).

## دووەم: تیوریی‌یە بابەتی‌یەکان (النظریات الموضوعیة):

ئەم تیوریانە بایەخ بە ناوەڕۆکی بنچینەی یاسایی ئەدەن نەك بە شێوەیەکی وە تیوری بابەتیەکانیش ئەمانەن (تیوری یاسای سروشتی، تیوری یاسای سروشتی بێ سنور یان سنوردار، تیوری پێشکەوتنی مێژوویی، تیوری مەبەستی کۆمەڵایەتی، تیوری هاوکاری کۆمەڵایەتی، تیوری یاسای بێ گەرد (نظریة القانون المحض او القانون النقي).

لەخوارەوە بە کورتی لە هەریەکێك لەو تیوریانە دەدوێین:

**ا- تیوری یاسای سروشتی:**

ئەم تیوریی‌یە پشتی بەو بیرۆکەیە بەستووە کە دەڵێ یاسایەکی سروشتی هەیە بریتی‌یە لە بەهایەکی باڵای چەسپاو‌و هەمیشەیی نەگۆڕ کە بە گۆڕانی کات‌و شوێن

ناگۆڕێو دەسکردی مرۆڤ نین بەڵکو دەسکردی سروشتن‌و لەگەڵ سروشتی شتەکان دەگونجێن‌و مرۆڤ لەرێگای ئەقڵی‌یەوە دەیاندۆزێتەوەو دادپەروەرن.

لەم پێناسەیەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە بیرۆکەی ئەم یاسایە ئەوە دەگەیەنێ کە هەندێ بنچینەی یاسایی هەن بەرزترو کۆنترن لە بنچینەکانی یاسای دانراو (القانون الوضعی) (یاسای بەرکار) ئەو بنچینانەش سەربەخۆو چەسپاوو هەمیشەیین‌و دەشێن بۆ هەمو کات‌و شوێنێك، واتە ئەم بنچینە یاساییانە لە بونیاندا قەرزاری ئارەزووی یاسادانەر نین‌و جیاوازو بەرزتریش لەیاسای بەرکار. وە ئەمەش واتای ئەوەیە، کەماف لەلایەن ئەم کەسانەوە لەرووی ناوەرکی‌یەوە یەك چەشنە بەوەی کە مافێکی سروشتی‌یەو لەرێی یاسای سروشتی‌یەوە بە مرۆڤ بەخشراوە.

بیرۆکەی یاسای سروشتی لەهەر سەردەمێك کۆرکێکی تایبەتی پێوەنووساوە کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە لەهەر سەردەمێك لەو سەردەمانەدا ئەم یاسایەیان گەڕاندۆتەوە بۆ سەرچاوەیەکی دیاریکراو.

بۆیە دەبینین لای قەشەی ئیتالی تۆماس ئەکوینی ئەم سەرچاوەیە بۆ ئاین گەڕاوەتەوە کەچی لەلای زانای فەرەنسی کرۆسیوس وای بۆ دەچێ کە یاسای سروشتی ئەوە نی‌یە کە خوا وای ویستووە بەڵکو لەبەر ئەوەی خۆی لەخۆی‌دا یاسای سروشتی‌یە. بە واتایەکی‌تر، مانای ئەوەیە یاسای سروشتی یاسای ئەقڵەو بە حوکمی سروشتی شتەکان سەرهەڵدەدا واتە بوونی یاسای سروشتی بەبوون‌و سروشتی شتەکانەوە بەندە.

بۆ نموونە لەبەر ئەوەی باوك هۆی هێنانە دونیاوەی منداڵەکانیەتی بۆیە دەبینین، بژێو (نفقە)ی منالەکانی دەکەوێتە ئەستۆ، ئەوەی شایەنی باسە، موعتەزیلەکان لەنێو زانایانی موسوڵمانان‌دا لەگەڵ ئەم بۆچوونەی کرۆسیوس‌دا یەك دەگرنەوە بەوەی کە بەلایانەوە ئەقڵ تاکە بنچینەو سەرچاوەی یاسای سروشتی‌یە نەك خوا یا یاسادانەر، بۆیە رۆڵی یاسادانەر بەلای ئەمانەوە بریتی‌یە لە دۆزینەوەو پەسند کردنی ئەو بنچینانەی کە ئەقڵ دەرکی پێ بردووە.

دوای ئەم ڕونکردنەوەیە دەتوانین بڵێین یاسای سروشتی ئەو یاسایەیە کە لەگەڵ سروشتی شتەکان دەگونجێت، بۆ نموونە لەبەر ئەوەی خوا بە سروشت پیاوی بە جۆرێکی بەهێزو بەتوانا دروست کردووەو ئافرەتیش بەشێوەیەکی ناسکو بێهێز لەچاو پیاو دروست کردووە بۆیە دەبینین بژێوی ژن لەسەر مێردەکەیەتی هەروەکو چۆن لەمادده (٥٨)ی یاسای باری کەسی عیراقی ژمارە (١٨٨)ی ساڵی ١٩٥٩ هەموار کراودا هاتووە: (بژێوی هەر مرۆڤێك لەسەر خۆیەتی تەنیا بژێوی ژن لەسەر مێردەکەیتی).

لەم حاڵەتەدا ئەو بنچینە یاسایی‌یەی کە لەلایەن یاسادانەرەوە بۆ ئەم مەبەستە دانراوە دەقاو دەقو کتو مت لەبنچینەی یاسایی سای سروشتی دەکات، چونکە ناکرێ بە پێچەوانەی ئەم بنچینەی دوایی بنچینەیەکی‌تر بۆ ئەم مەبەستە دابنێین.

لەراستیدا، هەموو مافەکانی مرۆڤ (مەبەستمان مافە سەرەکی‌و بنەڕەتی‌یەکانی مرۆڤە) مافی سروشتین‌و سەرچاوەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ یاسای سروشتی‌ی بۆیە هەرچەندی ئێمە بەرەو ئەو یاسایە بچین‌و لێی نزیك بینەوە ئەوەندە مافەکانی مرۆڤ زامنتر دەبن‌و یاساکەش بێ کەمو کوڕی دادپەروەر دەبێت هەروەها لەجیاتی یاسایەکی ناوخۆیی بەرەو یاسایەکی جیهانی دەچێت‌و یەکسانی‌و ئازادیش بۆ گشت کەسێك دابین دەکات‌و دادی کۆمەڵایەتیش دێتەدی.

ب- یاسای سروشتی بێ سنور (القانون الطبيعي ذي الحدود المتغيرة):

بەپێی ئەم تیوری‌یە یاسای سروشتی بریتی‌یە لە هەندێك بەهای باڵای دادپەروەری ئەو بەهایانە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك وە لەکاتێکیشەوە بۆ کاتێك دەگۆڕێن.

واتە پێش دەکەون بەپێی هەر وڵاتێکو هەر سەردەمێك هەر لەبەر ئەم هۆیەشە ناوی لێنراوە (تیوری یاسای سورشتی بێ سنور یان سنور نادیار) چونکە

نەبەستراوەتەوە بە سنورێکی دیاریکراو بە پێچەوانەی تیوری‌یەکەی پێشو کە وای بۆ دەچوو بنچینەکانی یاسای سروشتی چەسپاوو نەگۆڕین.

ج- تیوری پێشکەوتنی مێژوویی (تیوری سافینی):

بەپێی ئەم تیوری‌یە یاسا دیاردەیەکە لە دیاردەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی‌و بەشێکە لە کەلەپوری نەتەوایەتی وەکو زمان‌و ئاین‌و داب‌و نەریت، بۆیە یاسادانەر ناتوانێ کت‌و پڕ بە ویست‌و ئارەزووی خۆی بە جارێك دروستی بکات بەڵکو یاسا وەکو هەموو بوونەوەرە زیندووەکان وردە وردە گەشە دەکات بۆیە بارودۆخی کۆمەڵ کار لەیاسا دەکات‌و بەپێی ئەو بارودۆخی بەرەو پێشەوە دەچێت هەر ئەمەش وای کردووە یاسای هیچ وڵاتێك وەکو هی وڵاتێکی‌تر نەبێت‌و لەیەك جیاواز بن.

هەر لەم بارەیەوە سافینی دەڵێ: (بەگەشە سەندن‌و بەرەو پێشەوە چوونی گەل یاسا گەشە دەسێنێ‌و بەهێز بوونی گەلیش بەهێز دەبێت، هەروەها ئاشمێنێت بەو شێوەیەی کە گەل نەتەوایەتیەکەی لەدەست دەدات).

د- تیوری مەبەستی کۆمەڵایەتی یان تیوری ئیرنج:

یاسازان ئیرنج دەڵێ دیاردە کۆمەڵایەتی‌یەکان پابەندی یاسای مەبەست (قانون الغایە)ن واتە لە ئەنجامی ویست‌و ئارەزووی مرۆڤ دروست دەبێ بەمەبەستی بەدیهێنانی مەبەستێکی دیاریکراو.

وە لەبەر ئەوەی یاسا دیادەیەکی کۆمەڵایەتی‌یە بۆیە پابەندی یاسای مەبەستە واتە تەنیا وەسیلەیە ویست‌و ئارەزووی مرۆڤ بەکاری دەهێنێ بۆ بەدیهێنانی مەبەستێکی کۆمەڵایەتی کە پاراستنی کۆمەڵ وەدیهێنانی ئاسایشیەتی، بۆیە یاسا لە خۆیەوە دروست نابێت‌و گەشە ناسێنێ بەڵکو ویست‌و ئارەزووی مرۆڤ رۆڵێکی کاریگەری لەمەدا دەبێت.

## هـ- تیوری هاوکاری کۆمەڵایەتی یان تیوری لیون دگی:

یاسازان لیون دگی ئینکاری بوونی یاسایەکی سروشتی دەکات هەروەها ئینکاری ئەوە دەکات کە مافێکی سروشتی هەبێت لکا بێت بە کەسایەتی مرۆڤـو بەر لە کۆمەڵ هەبێت.

بە پێی بۆچوونی دگی یاسا بریتی‌یە لە کۆمەڵێك بنچینەی یاسایی پێویست بۆ بەدیهێنانو پاراستنی هاوکاری کۆمەڵایەتی بۆیە هاوکاری کۆمەڵایەتی سەرچاوەی یاسایەو دەبێ هاوڵاتیانو دەوڵەت پێکەوە وەکو یەك خۆیانی پێ بابەند بکەن. لەبەر رۆشنایی ئەمانەدا دەتوانین بڵێین بنچینە یاسایی‌یەکان قەرزاری ویستو ئارەزووی یاسادانەرو ئەقڵ نین بەڵکو کۆمەڵ لەخۆیەوە هێناویەتیەکایەوە هەر لەبەر ئەوەی ژیانێك کۆمەڵایەتی هاوبەش لەئارادایە.

بۆیە پێویستی‌یەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو بنچینە یاساییانە دێنێتەکایەوە بە شێوەیەك هەر کۆمەڵێك بنچینەی یاسایی تایبەت بە خۆیان هەیەو بەسەر گشت ئەندامەکانی ئەو کۆمەڵەیە دەچەسپێت دەسەڵاتمەندبن یان ژێر دەسەڵات.

## ز- تیوریی یاسای بێگەرد (نظرية القانون النقي):

یاسازان هانس کلسن یاسای بەزانستێکی سەربەخۆ دانا وەبۆیە گشت هزرێکی پێشینەیی بەدوور خستۆتەوە، هەروەها یاساو هۆکارەکانی رەوشتو رامیاریو فەلسەفەو دابو نەریتی لێك جیاکردۆتەوە.. دوابەدوای ئەوە هەستاوە بە لێك جیاکردنەوەی جیهانی سروشتو جیهانی یاسا.

دوای راڤەکردنی بۆ ئەم دوو جیهانەو چۆنێتی پەیوەندی رووداوە سروشتی‌یەکان لەگەڵ یەکتریدا بەهۆی پەیوەندی هۆکاری‌ی لەنێوان هۆو ئەنجامەکەی لەجیهانی سروشتدا هەروەها دیراسەکردنی پەیوەندی‌یە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان لەنێوان تاکەکەساندا لە جیهانی یاسادا، ئەو پەیوەندی‌یانەی کەوا بنچینە یاساییەکانی فەرمانکەر رێکیان دەخەنو پرنسیپی خستنە پاڵ (الاسناد) یان (لێپرسینەوە- المسائلە) حوکمیان دەکات واتە هەرکاتێك بارودۆخێك (الظرف) هاتەدی کە تاوانە دەبێ ئەنجامەکەی بێتە

دي كه بريتى‌يه له سزادان بەلأم سزا ئەنجامى تاوان نيه بەلْكو لەبەر ئەوەيە چونكه بنچينەيەكى فەرمانكەر هەيه فەرمانى كردووه بە سەپاندنى سزا لەكاتى هاتنەدى ئەو بارودۆخە.

وە لێرەوە هانس كلسن دەست دەكات بە لێكۆڵینەوە لە دروستى (صحـه) ئـەم بنچينەيه وە دەڵێ بۆ ئەوەى ئەو بنچينەيە دروست دەبێت دەبێ كۆك بێت لەگەڵ بنچينەيەكى پێشوو كە لەو بەرزتره دوابەدواى ئەوە تاوەكو دەگاتە دەستوورێكى پێشين وە ئەو دەستوورەش بەدەورى خۆى دەبێ كۆك بێت لەگەڵ دەستوورى يەكەم كە دەستورێكى بنەڕەتى‌يە كە ڕووداوێكى فعلى‌يەو دەكرێ گريمانەى ئەوە بكرێ كە سيفەتى ياساى تيايه وە نيزامى ياساى‌يى بە تەواوەتى لەسەر گريمانەيەك دروست كراوە گوايان دەستوورى بنەڕەتى بريتى‌يە لە كۆمەڵێك بنچينەى ياساى دروست وە ئەمەش ئەوە دەگەيەنێت ئەو كردارەى كە دەستوورى يەكەم دايناوە سيفەتە ياسايى‌يەكەى لە بنچينەيەكى پێشينە وەردەگرێت بەچەشنێك كە دەستورى بنەڕەتى‌و نيزامى ياسايى كە لەوەوە دروست دەبێت دروستى‌يەكەى لەو بنچينەيە وەردەگرێت وە ئەم بنچينەيەش كەوا سيفەتى ياسايى بە دەستورى يەكەم دەبەخشێت ئەو بنچينەيەيە كە هانس كلسن ناوى لێناوە بنچينەى بنەڕەتى.

هانس كلسن دوومەرجى سەرەكى بۆ بنچينەى ياسايى داناوە، يەكەميان دەبێ دروست بێت واته بۆ ئەوەى بنچينەيەك بە بنچينەى ياسايى دابندرێت دەبێ لەگەڵ بنچينەيەكى پێشين‌و لەخۆى بەرزتر كۆك بێت‌و سەرپێچى نەكات. مەرجى دووەميش ئەوەيە كە دەبێ سەركەوتوو (ناجح) بێت واتە لەلايەن تاكەكانى كۆمەڵ ڕێزى لێ بگيرێت‌و پەسەندى بكەن. هەروەها دەڵێ ئەگەر بنچينەكە سەركەوتوو (ناجح) نەبوو پێويست ناكات گريمانەى دروستێتى بنچينە بنەڕەتى‌يەكە بكەين.

به كورتى تيورى كلسن لەسەر ئەو بنچينەيە دروست كراوە گوايا هەر بنچينەيەك سيفەتە ياسايى‌يەكەى لە بنچينەيەكى لەخۆى بەرزتر وەردەگرێت وە بەم شێوە تادەگاتە بنچينە بنەڕەتى‌يەكە.

## سێیەم: تیوریی تێکەڵاو (زانستو داڕشتن):

یاسازانی فەڕەنسی جینی خاوەن ئەم تیورییەیە هەردوو تیورییەکانی پێشووی تێکەڵاو کردووەو توریی خۆی لێ دروست کردووەو وای بۆ دەچێ کە یاسا پێك هاتووە لە دوو رەگەز یەکێکیان کەرەستە خاوەکەیەتی کە پێی دەڵێن ناوەڕۆکی بنچینە یاسایی ئەوەی تریشیان شێوە دەرەکییەکەیەتی.

کەرەستە خاوەکەی پێك هاتووە لەو حەقیقەتانە کە ئەقڵ لە رووداوەکانی ژیان بۆی بەدیار دەکەوێ.

شێوەش بریتییە لەو وێنەیەی کە بنچینەی یاسایی دەبێ وەری بگرێت تاوەکو توانای چەسپاندنی هەبێت، کەواتە یاسا لە روانگەی جینییەوە پێك هاتووە لە رەگەزی زانستو داڕشتن.

## چوارەم: تیوری کۆمەڵ پەروەر (النظرية الاشتراكية):

لایەنگرانی ئەم تیورییە وای بۆ دەچن کە پەیوەندییەکی زۆر بەهێز لەنێوان یاساو ئابووریدا هەن.

بەلای ئەوانەوە ئابووری ژێر خانەیە (البناء التحتی)و هزریش سەرخانەیە (البناء الفوقی) وە لەبەر ئەوەی یاسا بەشێکە لە هزر کە سەرخانەیەی بۆیە بەپێی ژێر خانە واتە بنچینەی ئابووری- دیاری دەکرێت.

بەواتایەکیتر یاسا بریتییە لە تیشکدانەوەی ئەو بیرو بەرژەوەندییانەی لەناو کۆمەڵدا هەن.

تێبینی:

ئەم بابەتە هەندێکن لەو وانانەی کە لەلایەن ئێمەوە بۆ قوتابیانی قۆناغی یەکەم لە کۆلیژی یاساو رامیار بە هەردوو بەشی یاسا هەروەها رامیاری،و کۆلیژی مافو کۆلیژی بەڕێوەبردنو ئابووری بەشی ژمێریارییو کۆلیژی پۆلیس بۆ ساڵی خوێندنی ١٩٩٨-١٩٩٩ وتراوەتەوە.

# سەرچاوەكان


- قورئانی پیرۆز

١- فكرة القانون- اللورد دينيس ترجمة سليم الصويص.

٢- مذاهب القانون- د.منذر الشاوي.

٣- فلسفة القانون- دياس ترجمة هنرى رياض.

٤- فكرة القانون الطبيعي عند المسلمين د.محمد شريف.

٥- اصول القانون- د.آدم وهيب ود.سعيد عبدالكريم.

٦- ياساو ماف- كمال سعدى.

٧- فلسفة القانون- د.حسن علي ذنون.

٨- تيورى گشتى ياسا- د.سەعدى بەرزنجى.

٩- جاڕى گەردوونى مافى مرۆڤ.

١٠- المدخل لدراسة القانون- عبدالباقي البكري والاخرون.

١١- القانون- د.منير محمود الوتري.

١٢- المدخل الى دراسة النظام القانوني الانكليزي- د.مجيد حمسد.

١٣- المدخل لدراسة القانون- د.حسن كيرة.

## نووسەر لەچەند دێڕێکدا :



* لەساڵی ١٩٥٦ لەشاری هەولێر لەدایک بووە.

* لەساڵی ١٩٨٩/١٩٨٨ کۆلیژی یاسای لەزانکۆی سەلاحەددین تەواوکردووەو بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لەیاسا وەرگرتووە.

* لە ١٩٩٦/٥/٢١ بڕوانامەی ماجستێری لەیاسا لەنامەی (حق الملكية الادبية والفنية في القانون العراقي والمقارن) لەکۆلیژی یاساو رامیاری لەزانکۆی سەلاحەددین وەرگرتووە.

* قوتابی دکتۆرا بوو لە (معهد التاريخ العربي والتراث العلمي) لەبەغدا، بەڵام ئەنجومەنی زانکۆی سەلاحەددین بە بڕیارێک قەدەغەی خوێندنی کرد لەم ئامۆژگایەو تاکو ئێستاش لەجیاتی داخستنی ئەم دەرگایە پەنجەرەیەکی نەکردۆتەوە.

# سوپاسو پێزانین

* سوپاسێکی بێ پایان ئاراستەی مامۆستا نەژدەت سەبری ئاکرەیی بەڕێوەبەری چاپخانەی زانکۆو راگری کۆلیژی ماف دەکەم بۆ هەستی پاکی زانستیانەو هاوکاری کردنی لەپێناو بەرەو پێشەوە بردنی ووشەو یاساو دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی.

* هەروەها سوپاسی کارمەندانی چاپخانەی زانکۆ دەکەم، کە هەرگیز سەربازی ئامادەباش بوونە لەمەیدانی چاپو چاپەمەنیدا.

* هەروەها سوپاسی ئەو دڵسۆزانە دەکەم کە لەکاتی تەنگانەدا بەهانام هاتوون بەتایبەتی بۆ گەیاننی دەنگم بۆ ئەو لێپرسراوانەی کە دەنگم نایانگاتێ بۆ تەواوکرنی خوێندنی دکتۆرا.. هەرچەندە هەوڵو تەقەلای ئەوانیش بەهەمان دەردی هەوڵەکانی من رۆیشت چونکە من نە (...)م و نە (...) ئەوەشم، بەڵکو کوڕە (...) یێکم.

* ژمارە (١٣٤)ی سالی (١٩٩٩)ی کتێبخانەی نیشتمانی دراوەتێ.

چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین هەولێر